



ڕۆمان

# جەمشید خانی مامم

## کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد

بەختیار عەلی

# جەمشید خانی مامم
# کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد

بەختیار عەلی

ڕۆمان
2010

ناونیشان : جەمشید خانی مامم کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد
بابەت : ڕۆمان
نوسەر : بەختیار عەلی
ژمارەی چاپ: یەکەم
تیراژ : 10000
نرخ: 4500
ژمارەی سپاردن : 1572
بەرگ: ئارام عەلی
ساڵی چاپ : هاوینی 2010
چاپخانە: کارۆ

لە بڵاوکراوەکانی ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب



www.bachtyar-ali.com

له سەرەتای ساڵی 1979 دا کە جەمشید خان بۆ یەکەمجار گیرا تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو، ئەو کات بەعسییەکان لە سەرتاسەری عێراقدا دەستیانکردبوو بە راوەدوونان و گرتن و ئازاردانی کۆمۆنیستەکان کە تا ماوەیەکی کورت لەوەوبەر یەکێک لە هاوپەیمانە سەرەکییەکانی «شۆڕش و سەرۆکی فەرماندە» بوون. کەسمان بە دروستی نازانین جەمشید خان کەی و چۆن بووبوو بە کۆمۆنیست، بەتایبەت خێڵی ئێمە یەکێک بوو لەوانەی پێشتر کۆمۆنیستی تێدا هەڵ نەکەوتبوو... وەک دەڵێن جەمشید بە خۆگرییەکی گەورە و پاڵەوانێتییەکی بێوێنەوە بەرگەی ئەشکەنجەی زیندانەکانی گرتووە، ئازایەتی جەمشید و هیچ نەدرکاندنی وەها ئەفسانەیی بوون کارێکدەکەن جەلادەکان دەرهەقی هونەر بنوێنن و جار دوای جار شێوازی تازەتر و توندتر لە ئازاردانیدا بگرنەبەر، بەڵام بێئەوەی شتێکی ئەوتۆیان دەستبکەوێت. بەعسییەکان ماوەیەک جەمشید لە نێوان گرتووخانە بەناوبانگ و ترسناکەکانی عێراقدا دەهێنن و دەبەن، پێدەچێت هۆی سەرەکی لاوازبوونی جەمشید خان و لەدەستدانی بۆ کێشی خۆی بگەڕێتەوە بۆ ئەو ماوە دوورودرێژەی ئەشکەنجە و برسێتی کە لە زیندانە جیاوازەکاندا چەشتوێتی. ئەوانەی ئەودەم لە زیندان هاوڕێی جەمشیدبوون، باس لە دابەزینێکی کتوپڕ و سەیر و نائاسایی کێش لەلای جەمشید خان دەکەن. من بەئەستەم شێوەی ئەوم پێش گرتنەکەی لەیادە، ئەو چەند وێنەیەی خان کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی پازدە و شازدە ساڵانی ئەو، گەنجێکی خڕپلانە نیشاندەدەن کە شێوەی دوور نییە لە گۆشتنی و هەتا مەیلێکی ڕوونی بەلای قەڵەویشدا

ڕووەو قووڵایی ئاسمان دەیفڕێنێت و لە کەشکەشانی فەلەکدا لە هۆش خۆی دەچێت.

ئەو ماوەیەی جەمشید لە ئاسماندا بووە، ئەو کاتەی لە بەرزیدا ماوەتەوە، چەندی بڕیوە و چەندی خایەندوە ئاشکرا نییە. ئاخۆ ڕاستەوخۆ با و گەردباو ئەویان بەرەو شاری ئێمە گێڕاوەتەوە، کە هەڵبەت لە هەموو چوارقوڕنەی دونیاوە گەردەلوول و ڕەشەبا و سیاگێژە ڕوویان تێدەکرد، یان خانی بێهۆش ماوەیەک بە ئاسماندا گەڕاوە و ئەوسا کەوتۆتە سەر زەوی ؟ ئەوە پرسیارێکە کە هیچ کەس ناتوانێت وەڵامیبداتەوە. ئەوەی ئاشکرایە جەمشید دوای فڕینێکی درێژ لە زیندانەوە بە بیهۆشی لە سەر سەربانی دوکانێکی فیتەری دەکەوێت و دەمەوبەیانییەک شاگردێک دەیدۆزێتەوە.

جەمشید لە بیرێتی تا لە ئاسماندا بوو هەر کۆمۆنیست بوو، بەڵام هێندەی لەو سەربانەدا نیشتەوە، ئیدی کۆمۆنیست نامێنێت. بایەک کە جەمشید لە باشوورەوە بۆ باکوور هەڵدەگرێت، ئەوە لە بیر جەمشید دەباتەوە کە جاران چی بووە ... زۆرجاری دیش کە با جەمشید دەبات، هێندەی دەگاتەوە سەر زەوی شتێکی گرنگی تیا دەگۆڕێت و خولیایەکی قووڵ و شێتانەی تیا وەردەگەڕێت، جار دوای جاریش و لەگەڵ هەموو کەوتنەخوارەوەیەکدا بەشێکی یادەوەرییەکانی وندەبن و هەندێکی کاڵتر و کاڵتردەبنەوە. بە جۆرێک دەکرێت بڵێم ڕەنجی نوسینەوەی ژیانی ئەم پیاوە، کە هەرگیز یادی نامێنێت چییە و چی بووە، هەندێجار بێهودە دێتە بەرچاوم.

جەمشید نیوەڕۆیەکی درەنگ دەگاتەوە ماڵی حیسام خانی باپیرم. حیسام خان سەری لەم کورە بێگۆشت و لەڕە

دەسوڕمێت کە هەر پێستێکی ناسکە و بەسەر هەندێک ئێسکی باریکدا وشکبۆتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا گەڕانەوەی جەمشید، کە چەندین مانگە بێسەروشوێنە، دڵی باپیرەم زۆر خۆشدەکات، چونکە لەو زەمانەدا کە دڕندەیی بەعسییەکان تادێت باڵا و باڵاتر دەبێت، کەس بە ئومێدی ئەوە نییە هیچ بەندییەک لە زیندانی ئەوان ئازاد بێت. ئەوانەی بەعسییەکان دەیانگرن بەدەگمەن بە زیندوویی لەزیندان دێنەوە دەرێ، بەتایبەت گەر کۆمۆنیست بن. سەرەتا حیسام خان وادەزانێت بەعسییەکان شتێکیان لەسەر کوڕە بچوکەکەی نەدۆزیوەتەوە و ئازادیانکردوە، بەڵام کە جەمشید دەڵێت من با لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرتووم و حیکایەتی گەشتە هەواییەکەی خۆی بەوردی دەگێڕێتەوە، باپیرم کە پیاوێکی وەسواس و دووگومانە، مەراقی ئەوە دەیگرێت کە کوڕەکەی یان دەبێت زیندانی شکاندبێت و هەڵهاتبێت یاخود شێت بووبێت.

هەر ئەو ڕۆژە جەمشید خان لەترسی ئەوەی نەکەوێتەوە دەست بەعسییەکان، سەرلەنوێ خۆی دەشارێتەوە... من دوای ئەو ڕۆژە بە هەفتەیەک، لەگەڵ سمایلی ئەدیب خاندا بووم بەیاوەری جەمشید ... ئیشی ئێمە ئەوە بوو نەهێڵین «با» جەمشید لەگەڵ خۆیدا بەرێت.

ئەو تەنیا سێ ساڵ لە من و سمایل گەورەتربوو، بەڵام ئێمە بە کێش و گەورەیی چەند جارێک بەسەر جەمشیددا دەشکاینەوە. من کە بۆیەکەمجار بینیم، کەسێکی لەڕ و قوپاو بوو لە مەخلوقێک دەچوو لە کاغەزی بۆر دروست بووبێت، پیاوێکی تەنک کە لەسەر لا وەک خەتێکی باریک دەردەکەوت، هەر بەدەزوویەک دەچوو هەوا بیهێنێت و بیبات، بەتەنێک دەچوو نەسیم بیجوڵێنێت. ئیشی ئێمە ئەوەبوو لە ڕۆژانی بادا جەمشید

خان بە خۆمانەوە ببەستینەوە نەبا با بیفرێنێت. من و سمایل ئامۆزا بووین، هەردووکمان تەمەنمان پازدە ساڵان بوو، بەڵام دوو ساڵ بوو لە پۆلی یەکەمی ناوەندی دەرنەدەچووین، کاتێک خزمەکانمان کۆبوونەوە بۆئەوەی بیر لە حاڵی جەمشید بکەنەوە، ناوبانگی من و سمایل وەک دوو گەنجی بێپاشەڕۆژ و بێئیش لە ناو خێڵی خۆماندا دەنگیدابووەوە، ئەدیب خانی مامم کە کوڕە گەورەی حیسام خان بوو، یەکەمین کەس بوو کە پێشنیازی ئەوەی کرد سمایل بکاتە یاوەرێکی هەمیشەیی برا بەدبەختەکەی، دیارە سەرفراز خانی باوکی منیش بۆئەوەی غەمخۆری و برایەتی خۆی دەربخات، دەم و دەست دێتە گفت و دەڵێت کە ئەویش «سالار»ی کوڕی دەخاتە خزمەتەوە، چونکە کاری چاوەدێری و پاراستنی جەمشید بەیەک کەس ناکرێت.

من و سمایل بێکەڵکترین کەسی ناو خێڵی خۆمان بووین ... دوو گەنج، کەس چاوەڕوانی شتێکی باش و پاشەڕۆژێکی ڕوونی لێ نەدەکردین. جەمشید بۆئەوەی نەکەوێتەوە دەست بەعسییەکان دەبوو تا ئەوکاتەی چارەیەکی بۆ دەدۆزنەوە ڕووبکاتە ناوچە ئازادە شاخاوییەکان تا لەدەستی دەوڵەت و لە چاوی سیخوڕە نهێنییەکان بە دووربێت، گوندە کۆنەکەی ئێمەش لە شوێنێکی سارد و عاسیدا بوو لە چیاکان. هەفتەیەک دوای گەڕانەوەی جەمشید، باوکم منی خستە پێشی پیکابەکەی خۆی و گووتی «دەڕۆین بۆ بارانۆک». لە ڕێگا بەمنی گووت «لەمڕۆ بەدواوە تۆ لەگەڵ سمایلی مامە ئەدیبدا دەبنە پاسەوانی جەمشید خانی مامت، کە لە زیندان هەڵهاتووە... جەمشیدی مامت هەمیشە و لەهەر شوێنێک بێت پێویستی بە ئێوەیە، نابێت هیچ کەمتەرخەمییەک لە خزمەتکردن و هاوکاریدا بنوێنن، چونکە ئەو بۆتە پیاوێکی لاواز کە با هەمیشە لەگەڵ خۆیدا دەیبات». من

ئەوکات نەمویرا هیچ بلێم و بپرسم، بەڵام هیچ شتێک لە مانای ئەو دوا ڕستەیەی بابم تێنەگەیشتم. من پێشتر بەدەگمەن قسەم لەگەڵ جەمشید خاندا کردبوو، چونکە کە دەچووینەماڵی باپیرەم، ئەو لە ژوورەکەی خۆی نەدەهاتەدەرێ و زۆرجار بەخێرهاتنیشی نەدەکردین، ژوورەکەشی لەقاتی سەرەوەی ماڵی باپیرەم وەک قەڵایەکی قایم وابوو کە جگە لە خۆی و هاوەڵەکانی کەسی تر نەیاندەبینی ... جەمشید کە گیرا قوتابی ئامادەیی کشتوکاڵ بوو. دەبێت بڵێم من پێشتر مامە جەمشیدم خۆش نەویستبوو، نا لە بەرئەوەی کە کەم قسەی لەگەڵدا دەکردین، بەڵکو لەبەرئەوەی نیگایەکی زۆر ڕەق و تیژ و جیدی هەبوو، ئەو هەمیشە بەهانەیەکی هەبوو لە بڵندان و بەقێزەوە سەیری ئێمەبکات. هەڵبەت شتەکان لە دیدی ئەوەوە جۆرێکی تربوون، لە تەمەنی پازدە ساڵەوە کاتێک بوو بە کۆمۆنیست بەچاوی سووک و بچوک سەیری براکانی خۆی و حیسام خانی باوکی و خزمە نەجیبزادەکانیشی دەکرد، بە کەسانی ستەمکار و خوێنخۆری دەزانین و نەیدەهێشت کەس بە «جەمشید خان» بانگیبکات، بەڵکو دەبایە پێیبڵێین هاوڕێ جەمشید... ژوورەکەشی بە چەند وێنەیەکی گەورەی مارکس و ئەنگلز ڕازاندبووەوە. ئەو ڕۆژەی کە من لەگەڵ باوکمدا چووم بۆ گوندە دێرینەکەی خۆمان «بارانۆک»، ئەو وێنە کۆنەی جەمشید هێشتا هەر لە خەیاڵ و سەرمدا بوو... کۆمۆنیستێک کە لە بڵندان و بەبچوکی سەیری ئێمەی خانەدان دەکات. کە ماشێنەکەی ئێمە گەیشتە ئەوێ سمایل و ئەدیب خانی مامم بەر لە ئێمە لەوێ بوون. جەمشید بەتەنیا لەسەر فەرشێکی فارسی ڕەنگین لە ناوەڕاستی ژوورێکی گەورەدا لە تەنیشت حیسام خانی باپیرمەوە دانیشتبوو. ئەوکات ساڵ و نیوێک بوو من جەمشیدخانم نەبینیبوو، ئێستا بەڕوخسار هیچی لەو جەمشیدەی جاران

خان بە خۆمانەوە ببەستینەوە نەبا با بیفڕێنێت. من و سمایل ئامۆزا بووین، هەردووکمان تەمەنمان پازدە ساڵان بوو، بەڵام دوو ساڵ بوو لە پۆلی یەکەمی ناوەندی دەرنەدەچووین، کاتێک خزمەکانمان کۆبوونەوە بۆئەوەی بیر لە حاڵی جەمشید بکەنەوە، ناوبانگی من و سمایل وەک دوو گەنجی بێپاشەڕۆژ و بێئیش لە ناو خێڵی خۆماندا دەنگیدابووەوە، ئەدیب خانی مامم کە کوڕە گەورەی حیسام خان بوو، یەکەمین کەس بوو کە پێشنیازی ئەوەی کرد سمایل بکاتە یاوەرێکی هەمیشەیی برا بەدبەختەکەی، دیارە سەرفراز خانی باوکی منیش بۆئەوەی غەمخۆری و برایەتی خۆی دەربخات، دەم و دەست دێتە گفت و دەڵێت کە ئەویش «سالار»ی کوڕی دەخاتە خزمەتەوە، چونکە کاری چاوەدێری و پاراستنی جەمشید بەیەک کەس ناکرێت.

من و سمایل بێکەڵکترین کەسی ناو خێڵی خۆمان بووین ... دوو گەنج، کەس چاوەڕوانی شتێکی باش و پاشەڕۆژێکی ڕوونی لێ نەدەکردین. جەمشید بۆئەوەی نەکەوێتەوە دەست بەعسییەکان دەبوو تا ئەوکاتەی چارەیەکی بۆ دەدۆزنەوە ڕووبکاتە ناوچە ئازادە شاخاوییەکان تا لەدەستی دەوڵەت و لە چاوی سیخوڕە نهێنییەکان بە دووربێت، گوندە کۆنەکەی ئێمەش لە شوێنێکی سارد و عاسیدا بوو لە چیاکان. هەفتەیەک دوای گەڕانەوەی جەمشید، باوکم منی خستە پێشی پیکابەکەی خۆی و گووتی «دەڕۆین بۆ بارانۆک». لە ڕێگا بەمنی گووت «لەمڕۆ بەدواوە تۆ لەگەڵ سمایلی مامە ئەدیبدا دەبنە پاسەوانی جەمشید خانی مامت، کە لە زیندان هەڵهاتووە... جەمشیدی مامت هەمیشە و لەهەر شوێنێک بێت پێویستی بە ئێوەیە، نابێت هیچ کەمتەرخەمییەک لە خزمەتکردن و هاوکاریدا بنوێنن، چونکە ئەو بۆتە پیاوێکی لاواز کە با هەمیشە لەگەڵ خۆیدا دەیبات». من

ئەوکات نەموێرا هیچ بڵێم و بپرسم، بەڵام هیچ شتێک لە مانای ئەو دوا ڕستەیەی بابم تێنەگەیشتم. من پێشتر بەدەگمەن قسەم لەگەڵ جەمشید خاندا کردبوو، چونکە کە دەچووینە ماڵی باپیرەم، ئەو لە ژوورەکەی خۆی نەدەهاتەدەرێ و زۆرجار بەخێرهاتنیشی نەدەکردین، ژوورەکەشی لەقاتی سەرەوەی ماڵی باپیرەم وەک قەڵایەکی قایم وابوو کە جگە لە خۆی و هاوەڵەکانی کەسی تر نەیاندەبینی ... جەمشید کە گیرا قوتابی ئامادەیی کشتوکاڵ بوو. دەبێت بڵێم من پێشتر مامە جەمشیدم خۆش نەویستبوو، نا لە بەرئەوەی کە کەم قسەی لەگەڵدا دەکردین، بەڵکو لەبەرئەوەی نیگایەکی زۆر ڕەق و تیژ و جیدی هەبوو، ئەو هەمیشە بەهانەیەکی هەبوو لە بڵندان و بەقێزەوە سەیری ئێمەبکات. هەڵبەت شتەکان لە دیدی ئەوەوە جۆرێکی تربوون، لە تەمەنی پازدە ساڵەوە کاتێک بوو بە کۆمۆنیست بەچاوی سووک و بچوک سەیری براکانی خۆی و حیسام خانی باوکی و خزمە نەجیبزادەکانیشی دەکرد، بە کەسانی ستەمکار و خوێنخۆری دەزانین و نەیدەهێشت کەس بە «جەمشید خان» بانگیبکات، بەڵکو دەبایە پێیبڵێین هاوڕێ جەمشید... ژوورەکەشی بە چەند وێنەیەکی گەورەی مارکس و ئەنگلز ڕازاندبووەوە. ئەو ڕۆژەی کە من لەگەڵ باوکمدا چووم بۆ گوندە دێرینەکەی خۆمان «بارانۆک»، ئەو وێنە کۆنەی جەمشید هێشتا هەر لە خەیاڵ و سەرمدا بوو... کۆمۆنیستێک کە لە بڵندان و بەبچوکی سەیری ئێمەی خانەدان دەکات. کە ماشێنەکەی ئێمە گەیشتە ئەوێ سمایل و ئەدیب خانی مامم بەر لە ئێمە لەوێ بوون. جەمشید بەتەنیا لەسەر فەرشێکی فارسی ڕەنگین لە ناوەڕاستی ژوورێکی گەورەدا لە تەنیشت حیسام خانی باپیرمەوە دانیشتبوو. ئەوکات ساڵ و نیوێک بوو من جەمشیدخانم نەبینیبوو، ئێستا بەڕوخسار هیچی لەو جەمشیدەی جاران

نەدەچوو، شتێک کە زۆر جێگای سەرەنجی من و سمایلیش بوو ئەوەبوو، کە ئەشکەنجەی زۆر گەرچی بەوجۆرە ئەفسانەییە کێشی مامە جەمشیدی داگرتبوو، بەڵام هیچی لە دەعبیە و غروری دانەبەزاندبوو. زیندان نەوەک نەیتوانیبوو جەمشید تێکبشکێنێت، بەڵکو بەفیز و بەهەواتری کردبوو. حیسام خان کە خانی گەورەشمان پێدەگووت روویکردە من و سمایل و گووتی «بەعسییەکان هێندە ئازاری جەمشیدیان داوە، کێشی نەماوە، کورەکەم خەریکە دەبێتە ڕۆحێکی بێجەستە. دەبێت تا تۆزێک کێش پەیدادەکات و دووبارە وای لێدێت بەزەوییەوە بنووسێت. لەگەڵیدا بن. هەر کات چووە دەرێ بە خۆتانەوە بیبەستنەوە، لە ڕۆژی بای قایمدا بەری نەدەن... باشترە هەوڵبدەن لەوجۆرە ڕۆژانەدا هەر نەیبەنە دەرێ. ئیشی ئێوەیە کە چاودێری خواردنی جەمشید و تەندروستی بکەن. سبەی دکتۆر نەجیب خان دێنین بۆئەوەی پشکنینێکی تەواوی بۆ بکات. تۆش جەمشید دکتۆر نەجیب چی گووت و چ جۆرە خواردنێکی بۆ نوسیت دەبێت بیخۆیت... لێرە من ماڵی ساڵح هیندیم ڕاسپاردوە کە ڕۆژانە نانتان بۆبکەن و بۆتان بهێنن. ئێوەش بەهیچ جۆرێک جەمشید لەو جێگایانە نزیک ناکەنەوە کە سوپای عێراق بارووبنەی تێدا خستووە... دەبێت چاوەروانبین تا حکومەت عەفوویەکی تازە دەردەکات و ئێوە دێنەوە بۆ شار، تا ئەوکات هەرچییەک بووە نابێت لە جەمشیدی مامتان غافڵبن».

ئیشەکە بۆ سمایلی مامم، کە حەزی لە فێربوونی زمان و دانیشتن و کتێب خوێندنەوە بوو، خۆش و ئاسان بوو. من و سمایل هەردووکمان ڕقمان لە مەکتەب بوو. بەڵام سمایل ئارەزووی لە ژیانی ماڵەوە و دونیای کتێب بوو؛ بە پێچەوانەی منەوە کە دەمویست کاتی خۆم لە گەڕانی ئازاد و سەرەڕۆیی و

خانمبازیدا ببەمەسەر. سەرەتا حیسام خان چەند پارچە گوریسێکی ئەستوور و کورتی نیشانداین و گووتی «هەرکات پێکەوە چوونە دەرەوە دەبێت لە نزیکی جەمشیدی مامتانەوە برۆن، هەردووکتان یان لایەنی کەم یەکێکتان ئەم پەتەی کەمەری جەمشیدی بەدەستەوە بێت و توند بیگرێت، ئەگەر پێویستیکرد ئەویش گوریسەکە لە قەدی خۆی بئالێنێت، ئەبا ڕەشەبا ئاسان خانی کوڕم لەگەڵ خۆیدا ببات... ئەگەر با زۆر زۆر بەهێزبوو، دەبێت هەر دووکتان بیگرن تا توند بەئەردەوە بنووسێت... چونکە گەر با بیبات، هەر خودا خۆی دەزانێت ئەمجارە چی بەسەر دێت و لە کوێ دەکەوێتەوە».

جەمشید لەسەرەتادا بێدەنگ بوو، بەڵام دواتر وەک یەکێک گاڵتەی بە هەموو شتەکان بێت، سەیری ئێمەی دەکرد و سەری دەلەقاند و هەندێک ڕستە و وشەی حیسام خانی باپیرەمی دووبارەدەکردەوە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژەمان بەوە تەواوکرد، کە هەر یەک لەسەرفرازخانی باوکم و ئەدیب خانی بابی سمایل دوو وانەی درێژیان دایە ئێمە و گووتیان نابێت ئەوەمان لە یادبچێت کە جەمشید لای ئەوان چ خۆشەویست و گرنگە و گەر شتێکی لێبێت بە دڵنیاییەوە باپیرە حیسام لەوانەیە حاشامان لێبکات و موڵک و وەرەسەشمان لێحەرامبکات. دواتر کە من وسمایل بەتەنیا ماینەوە، سمایل ڕای وابوو کە ئەم ئیشەمان لە چوون بۆ مەکتەب خۆشترە و لێرە لە ناو سروشتدا دەتوانین زۆر شت فێرببین، منیش لەو خاڵەدا هاوڕابیووم ، بەڵام بەجێهێشتنی شار بۆ من کارێکی ناخۆش بوو، چونکە دەبوو لە هەموو ئەو کچانە دووربکەومەوە کە پەیوەندیم لەگەڵیاندا هەبوو، ئەمە جگە لەوەی لەو دوو ساڵەی دواییدا بەدزی سەرفراز خان و هەموو

خزمانیشەوە زۆر دەچووم بۆ سینەما و سەیرکردنی فلیمی هیندی بووبوو بە بەشێکی گرنگی ژیانم. ئێستا دەبوو دەستبەرداری هەموو شتێک ببم و خۆم بۆ خزمەتی یەکێک تەرخانبکەم کە خۆشم نەدەویست. ئەوە کارێکی وەها بەهادار و بەتام نەبوو لەلام.

دانیشتنی یەکەممان لەگەڵ جەمشید خان خۆیدا شتێکی ئەوتۆ نەبوو، من تەنیا فریای ئەوەکەوتم سەرسام سەیری تەنکی و لاوازییەکەی بکەم، جەمشید کەمێک باسی زیندانی بۆ کردین و گوتی لە کاتی ئەشکەنجەدا ئازاری زۆربووە، بەڵام هیچ کەس لە دونیادا نییە بتوانێت بەزۆر شتێک لەو بستێنێت. ئێمە لە گەرمەی قسەکردندا بووین کە خەیاتێکی تایبەت هات تا بەپێی گەورەیی و تەنکی جلی تایبەتی بۆ بکات. لەو ڕۆژەوە تا گەڕاینەوە بۆ شار، جەمشیدی مامم جگە لە ئێمە کە پاسەوانی هەمیشەیی خۆی بووین، پزیشکێک و بەرگدروویەکی تایبەتیشی هەبوو. جەمشید بەدەنگی کەسێک کە خۆی دەزانێت چی دەکات و چی دەوێت، بە ئێمەی گووت هەرچییەکی ویست و دڵی بە هەرشتێکەوە بوو، ئێمە دەبێت ئەوە بکەین، داوای هەرچییەکی کرد دەبێت جێبەجێیبکەین، نهێنییەکانیشی بپارێزین و هیچ شتێکی نەدرکێنین و هیچ ڕازێکی نەبەینە دەرەوە. ئەوکات وامدەزانی جەمشید دەیەوێت بەدزی باپیرەوە درێژە بە خەباتی کۆمۆنیستی خۆی بدات، بەڵام دواتر تێگەیشتم لەو بارەوە شتێکی لە خەیاڵدا نییە و بگرە گاڵتەیەکی زۆریشی بە کۆمۆنیستەکانی دونیا دێت.

بارانۆک خۆی گوندێکی بچوک بوو، هەموو دانیشتوانەکەی لە دە ماڵ تێنەدەپەڕی، لەگەڵ ئەوەشدا کە یەکەم ئێوارە من و سمایل پەتەکەمان لە قەدی جەمشید بەست و سمایل سەرێکی گرت و

چووین بۆ مزگەوتی گوند تا ناو بهێنین... هەستمکرد جەمشید زۆر حەزی لەوەیە بە دەوروبەری گوندەکەدا بگەڕێین و دونیا ببینێت، لە دوای ماڵاوایکردنی لە کۆمۆنیزم، حەزێکی کتوپڕ بۆ تێگەیشتن و تەماشاکردنی سروشت پەرپیبووە سەری. ئەو ڕۆژە کزەیەکی زۆر لاوازی هەبوو، بەڵام هێندە نەبوو بتوانێت جەمشید بەرزبکاتەوە... جەمشید خۆشحاڵانە لە پێشمانەوە دەڕۆی، پیاوێکی بچوک و تەنک کە هەموو گوندەکە بە گەورە و منداڵییەوە هاتبوونە سەیری. ئەو چەند پیرەی لە دێکەدا دەژیان و لەدایکبوونی باوکی جەمشیدیشیان لە یادبوو، هاتن بۆ بەخێرهاتنی و لە نهێنی ئەو پەتەشیان پرسی کە سەرێکی بەردەوام بە دەست من یان سمایلەوە بوو. جەمشید بە لووت بەرزییەوە پێیگووتن «ئەو پەتە بۆ ئەوەیە لە کاتی ڕەشەبادا نەفرم و گەر گێژەڵوکەی گەورە هات بەرێزمان با نەیبات»... جەمشید لەو قۆناغەیدا حەزی لە تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکی سادە و ساکاردا نەبوو، لەبەرئەوە بەزۆر بردینی بۆ دەرەوەی گوند و لە ژێر تیشکی مانگەشەودا بەرەو بەرزاییەکی بچوک سەریخستین و لەسەرترۆپکی گردە بچکۆلەیەک وەستاین... من لەو شەوەوە هەستمکرد کە جەمشید حەزی لە فڕینە... لەسەر گردەکە بە پێوە وەستا و دڵنیابووم چاوەڕوانی با دەکات. بەڵام جگە لە شەماڵێکی زۆر لاواز هیچی دی هەڵی نەکرد... تا شەو درەنگ جەمشید ئێمەی لەوێدا دانا، بێئەوەی هیچی ئەوتۆ بڵێت، تەنیا هەوای پاکی هەڵدەمژی و سەیری ئەستێرەی دەکرد و بیری لە شتێکی نادیار دەکردەوە.

ڕۆژی دواتر کە دکتۆر نەجیب هات و خانی پشکنی، وەک یەکێک لەبەرابەر موعجیزەیەکی گەورەدا وەستابێت سەراسیمە بوو، دکتۆر دواتر ئێمەی بردە لاوە و گووتی کە دەبێت زۆر

ئاگاداربین، چونکە دەشێت تووشی نۆبەتی کتوپڕی شەڕانگێزی بێت، دوور نییە ناو بە ناو غەمۆکی بیگرێت یاخود هەوڵی خۆکوژیش بدات. دکتۆر دەیگووت کە کێشی ڕاستەقینەی جەمشید تەنیا لەسەریدایەتی و ئەوەی بۆ لەشی دەمێنێتەوە شتێکی وا کەم و ناچیزە لەدەرەوەی سنووری ڕوونکردنەوەی پزیشکی و لۆژیکی زانستییەوەیە. پێشنیاری ئەوەشی کرد کە باشترە جەمشید ماوەیەک زۆر شتی چەور بخوات و کەم بجوڵێت تا ببینین ئاخۆ دەرفەت هەیە، کێشی هەستێتەوە ... بە تێپەڕینی ساڵان کەم کەم ڕاستی و دروستی قسەکانی دکتۆر نەجیب دەرکەوت، بەڵام تا ئەوکاتەی من دەمناسی، خواردنی زۆر و تێکەڵبوون بە کەیف وسەفا کێشی خانیان نەهێنایەوە حیساب و ڕاستیان نەکردەوە.

دوای ڕۆیشتنی دکتۆر نەجیب، جەمشید بە دەم لاقرتی و سووکایەتیکردن بە دکتۆرەوە بە ئێمەی گووت هەرگیز نایەوێت کێشی زۆر بێت، چونکە ئارەزوویەکی نییە تا هەتا هەتایە بە زەوییەوە بنووسێت. جەمشید هەرگیز ئەو دەرمانانەی نەخوارد کە دکتۆر نەجیب بۆی نوسی، بەڵکو هەر کات بچووبایەتە مزگەوتی گوند حەبەکانی دەکرد بە ئاوەڕۆکەدا. ڕۆژێکیش ئێمە پێمانزانی فەرمانێکی توند و بێڕەحمانەی پێداین تا چیرۆکی کەمتەرخەمی و ڕێزنەگرتنی لە قسەی پزیشک بۆ کەس نەگێڕینەوە و باپیرە حیسامی لێئاگادارنەکەین.

من و سمایل لەیەکەم ڕۆژەوە لێیدەترساین... گەرچی ئێمە لەو بە هێزتر و گەورەتر بووین، بەڵام تەنیا بەسەیرکردن دەیتوانی وامان لێبکات هەموو کارێکی بۆ ڕاپەڕێنین. هەر لەسەرەتاوە بە ئێمەی گووت «گەر باش بین» ئەوا تەمەنێکی دوورودرێژمان هەیە پێکەوە بیبەینەسەر.

من سەرەتا باوەڕم نەدەکرد کە با بتوانێت جەمشید خان بفڕێنێت، بە سمایلم گووت هەمووی درۆیە، هەمووی چیرۆکێکی دروستکراوە تا ئێمە لە شار دووربخەنەوە، گووتم خانەکان کۆبوونەوەیەکی نهێنیان کردوە و بڕیاریان داوە، من و تۆ لە بەرچاوی شار ونبکەن، چونکە بە هۆی دەرنەچوونی بەردەوامامانەوە لە مەکتەب ناو و ناوبانگی خانەوادەکەمان خستۆتە مەترسییەوە و ئابڕووی تایەفەکەمان بردوە. سمایل گووتی هیچ کۆبوونەوەیەکی نهێنی نەکراوە، هێند هەیە لەبەرئەوەی من و تۆ دوو بێکەڵکترین کەسی ناو تایەفەکەین ئەم ئیشەیان پێسپاردوین کە هەم گرنگ و هەم ئاسانیشە. ئینجا کەمێک خەفەتبار سەیریکردم و گووتی «من پێم ناخۆش نییە تا مردن لەگەڵ ئەم نیوەپیاوەدا ئیشبکەم کە جگە لەوەی بە گوریسێک بیگرین هیچی دی لە ئێمە ناوێت، گەرچی هەستێکی باشم نییە و واتێدەگەم ڕۆژێک لە ڕۆژان بە هۆی ئەوەوە تووشی کارەساتێک دەبین ». بەڵام لەگەڵ ئەو تێڕوانینەی سمایلدا کە هەم سادەبین و هەم تراژیدیش بوو، من دڵنیابووم ئیشەکەی ئێمە لەوە سەختترە و لە داهاتووشدا ژیانێکی وەها ئاسان و سادەمان نابێت، بەڵام ئەو کات نەمدەزانی گرفتەکان چیین و کێشەکان چۆن دەبن.

لە هەفتەی یەکەمماندا لە بارانۆک با بەهیچ کلۆجێک هەڵی نەکرد. هەوا بەجۆرێک بێ سروە بوو، جەمشید نەیدەهێشت پەتیبکەین و بیبەستینەوە، خۆی پێشماندەکەوت و بە ناو کێڵگە و مەزرا و چۆم و پەڵە چنارانی دەوروبەردا پیاسەیدەکرد. ئەودەم من مامم وەک عاشقێکی گەورەی گوڵ و میوە و درەخت ناسی، پیاوێک گەرچی نرخێکی زۆری لەسەر ژیانی مرۆڤ دانەدەنا، بەڵام حەزێکی زۆری لە پیاسە و گەڕانی ناو

دەشت و دەر بوو. بەڵام لە کۆتایی هەفتەی دووەمدا دارودرەخت کەوتنە جوڵە و سەرەتای بایەکی بەهێز دەرکەوت، شەوێک کە با زۆر بەهێزبوو جەمشید پێیگووتین کە دەبێت چەند گوریسمان هەیە لە یەکی ببەستین و بیبەینە دەرێ. من و سمایل سەرەتا ترساین و ویستمان بەگوێی نەکەین، چونکە رەشەبا تا دەهات قایمتر و قایمتر هەڵیدەکرد، بەڵام کاتێک دونیا تەواو تاریک داهات و هەموو خەڵکی بارانۆک خەوتن، زۆری لێکردین و بە ناچاری بەستمانەوە بە خۆمان و هەردوو دەستیمانگرت و چی گوریسمان هەبوو خستمانە فەردەیەکی کۆنەوە و لەگەڵیدا چووینە دەرەوە.

دوای دەربازبوونی لە زیندانی بەعسییەکان، ئەوە یەکەمین چوونەوە بەر بای جەمشید بوو. .

من و سمایل سەروو لایتی دەستیمان پێبوو کە بە نۆبەت داماندەگیرسان... بە ناو شەودا تا سەر ئەو گردە چکۆلانەیە چووین کە پێشتر لە رۆژانی خۆشیشدا زۆر رێمان تێیدەکەوت. با لەوێدا وەها بەهێزبوو خەریکبوو من و سمایلیش بەرێت، هەردووکمان توند جەمشیدمان گرتبوو بۆ ئەوەی با هەڵینەگرێت و لەگەڵ خۆیدا نەیبات. کە گەیشتینە ئەوێ جەمشید گووتی «خۆتان توندبگرن و من بەردەن». سەرەتا من و سمایل رازی نەبووین بەریدەین، بەڵام ئەو هێوریکردینەوە و گووتی «مەترسن، نابینن من بە دوو پەتی ئەستوور بە کەمەری هەردووکتانەوە بەستراوم و گەر باش بمبات دەتوانن بمهێننەوە». لە ساتێکدا هەردووکمان دەستمان لە جەمشید بەردا و بۆ یەکەمجار بینیمان کە با چۆن مرۆڤێک لەسەر زەوی هەڵدەگرێت... جەمشید لە چاوتروکانێکدا جارێکی دی وەک مەخلوقێکی سووک و بێکێش خۆی لە هەوادا بینییەوە. بەوەدا

پەتەکان کورتبوون، مەودای دوورکەوتنەوەی لە ئێمە و بەرزبوونەوەی لە زەوی کەم بوو. لەسەرەوەڕا فەرمانی پێکردین کە دایگرین و چی پەتمان لەگەڵ خۆماندا هێناوە بیکەین بە یەک و سەرێکی لە کەمەری ئەو ببەستین و سەرەکەی دیشی لە خۆمان و لە دەستمان بئاڵێنین، لە کاتێکدا سمایل توند جەمشید خانی گرتبوو، من هەموو گوریسەکانم دەرهێنا و پێکەوە توند گرێمدان و لە کەمەری توندمکرد و وردە وردە لەگەڵ سمایلدا، جەمشیدمان بۆ بەر با بەردا. ئەمجارە مامم زۆر لە زەوی بەرزبووەوە، پتر لە باڵای کۆشکێکی دوو نهۆم لەسەر سەرمان وەک کۆلارەیەک کەوتە مەلەکردن و وەک باڵندەیەک لەدەوری نێچیرێک بسوڕێتەوە بەو چەشنە لەهەوادا دەسوڕا و دەچوو ... ئەوە ئەو ساتەبوو کە باوەڕمهێنا کە جەمشید لەزەتێکی وەها زۆر لەو فڕینە دەبینێت، هەرگیز دەستبەرداری نابێت و ژیانی ئێمەش بۆ هەتاهەتایە گیرۆدەی ئەو خواستەی ئەو دەبێت کە جیهان لەسەرەوەڕا تەماشابکات. جەمشید لەو بەرزییەوە کەوتە قسەکردن و پێیگووتین کە جۆرە هەستێکی هەیە پێشتر لە ژیانیدا نەیبووە، هەستێکە لە خۆشی کەسێکدا کورت ناکرێتەوە کە با فڕاندوێتی و دەتوانێت لە باڵاوە لە خوارەوە بڕوانێت، بەڵکو هەستی یەکێکە کە دڵنیاییە ژیانێکی هەیە ئەوانی دی نایانبێت و ئیشکەلێک دەکات کەسی دی نایکات و شتگەلێکیش دەبینێت کە جگە لەو کەسی دی نایانبینێت. ئەو شەوە بەچەشنێک زوڵمەتاوی و ئەنگوستەچاو بوو، ئێمە لەسەر ئەو گردەوە و جەمشیدیش بە هەواوە شتێکی وەها گرنگمان لێدیار نەبوو، بەڵام جەمشید زۆر چێژی لەو تاریکییە قووڵە دەبینی. جەمشید خان هەر لە شەوی یەکەمەوە کەوتە خۆڕاهێنان تا لەگەڵ گوژمی باکەدا لەنگەربگرێت و وابکات

وەرگەڕان و جولآن و ئاڕاستەگیری خۆی ڕێکبخات، بێئەوەی پەتەکەی بئاڵۆزێ و ئازاری بدات.
ئەو شەوە کە گەڕاینەوە بۆ ماڵ، جەمشید خان زۆر دڵی خۆش بوو، دڵنیابوو ئەو فڕینەی لە زیندان، تاکە فڕین نەبووە و بەڵکو هەموو ژیانی هەلی ئەوەی لە پێشدەمدایە بفڕێت و وەک باڵندە بژی. پێموایە هەر ئەو شەوە گەیشتە ئەو بڕوایەی کە لە داهاتوودا بە ڕاستی پێویستی بە ئێمە دەبێت و تێگەیشت کە ژیانی لە ئێستە بەدواوە بەو ڕایەڵەوە بەستراوە کە من و سمایل لە خوارەوە بۆی دەگرین. دوای ئەو فڕینە ڕەفتاری لەگەڵ من و سمایلدا گۆڕا و تادەیتوانی دۆستانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردین.

ڕۆژانی دواتریش لە بارانۆک و دەڤەرەکانی دەوروبەری هەر ڕەشەبا بوو. جەمشید خان گووتی «ئەم بایەی ئێستا هەڵدەکات هەلێکی باشە کە مەشقی تێدابکەین، چونکە دەبێت من دوو شتی گرنگ فێرببم، یەکێکیان ئەوەیە چۆن لە بادا بە ئاسماندا بفڕم، ئەوی دیکەش چۆن بە زەویدا بڕۆم... ڕۆیشتنم بە ئاسایی لەسەر زەوی، بە هەمان ئەندازەی فڕینم بە ئاسماندا گرنگە... چونکە دەبێتە ئابڕوچوونێکی گەورە بۆ من و بۆ هەموو خانەدانانی تایەفەکەمان گەر ڕۆژێک لە جێگایەکی گشتیدا با بمبات».

کێشەی گەورەی ئەو سەرەتایەمان چۆنێتی و چەشنی گوریسەکان بوو. ئەو گوریسانەی دەبایە لە ڕۆژدا و بۆ ناو خەڵک بەکاریانبهێنین، گوریسی زۆر کورت بوون کە جەمشیدیان بە ئێمەوە دەنووسان، بەجۆرێک هەندێجار دەبایە وەک سیانەیەکی پێکەوەلکاو بڕۆشتباینایە تا خەڵک زۆر سەرەنجی پەتەکەی نێوانمان نەدەن و بایەکی خێراش جەمشید لە دەستمان نەفڕێنێت.

دواتر هەموو ڕۆژێکی بامان بەکاردەهێنا تا تەکنیکەکانی خۆپاراستن گەشەپێبدەین و شێوەکانی ڕۆیشتنمان بە سروشتی ڕابگرین. جەمشید ناردی هەم لە شار و هەم لە ئێرانەوە هەموو شێوەکانی پەت و ڕەنگەکانیمان بۆ هات، لەو ماوەیەدا تاقیکردنەوەی قایمی و توانای کشان و سەرنجدان لە ڕەنگی ڕایەڵ و گوریسە جیاجیاکان بووبوو بە بەشێکی گرنگی ژیانمان. لە هەموو چوونە دەرەوەیەکدا خۆی ڕەنگ و ئەستووری پەتەکانی هەڵدەبژارد و دەبایە هەمیشەش چەند پەتێکی دیکەی یەدەکمان بۆ کاتی پێویست پێبێت کە من لە جانتایەکی ڕەشدا هەڵمدەگرتن. لەو دەمەدا سمایلیش خولیا و خەیاڵاتی خۆی هەبوو، کاتی بەتاڵی خۆی لە فێربوونی عەرەبی و ئینگلیزیدا دەبردەسەر. ئەوکات جەمشیدیش ناردی و لە شار کتێبی زۆری بۆهات، یەکێک لەو کتێبانە ئەسڵی چەشنەکانی چارلز داروین بوو. ئەو چەند مانگەی لە بارانۆک بردمانەسەر، مامم هەموو کاتی خۆی بۆ خوێندنەوەی ئەو کتێبە تەرخانکرد، چونکە لەساتەکانی فڕیندا بیرۆکەیەک پەڕیبووە خەیاڵی و دەیوست تیورەیەکی دژ دابرێژێت و بیسەلمێنێت کە مرۆڤ لە باڵندەوە گەشەیکردوە نەوەک لە مەیمونەوە. هەتا چەند شەوێک من و ئەو لە گورستانی بارانۆک بەدزییەوە هەندێک گۆڕی کۆنمان هەڵدایەوە و ئێسکەکانیمان دزی تا جەمشید بە ئێسکی ئەو باڵندانە بەراوردیانبکات کە بە ڕۆژ دوای نانخواردن لەسەر سفرەکە جێدەمان. هەر ئەو ماوەیە کەوتە نامەگۆڕینەوە لەگەڵ هەندێک مامۆستای بایۆلۆژیادا لە شار و لەوێشەوە ئەدرێسی هەندێک پرۆفیسۆری زانکۆی بەغدادی پەیداکرد کە تایبەتمەندی تیوری گەشەی چەشنەکان بوون دەرەنجامی کۆی نامەگۆڕینەوەکانیش بۆ مامم مایەی نائومێدی بوو، چونکە مامۆستا و پرۆفیسۆرەکان پێکڕا لەسەر ئەوە ڕێکبوون کە

بۆچوونی وەها هەڵەیە و لە ورێنەی شێتێک بەولاوە هیچی دی نییە. دیارە تیۆرییەکەی جەمشید لەسەر سێ بنەما دامەزرابوو، زۆربەی کاتەکەش بەدرێژیی لەگەڵ سمایلدا لەو سێ بنەمایە ڕادەمان و تاوتوێیاندەکرد. جەمشید خان ڕای وابوو کە سەیرکردنی مرۆڤ بۆ خودا وەک مەخلوقێک کە لەسەرەوە بۆ خوارەوە دەنواڕێت و لە بڵندییەوە ئادەمیزادان دەبینێت، دەگەڕێتەوە بۆ یادەوەری دێرینی مرۆڤ، دەمانێک خۆی توانیویێتی بفڕێت. ئەو پێیوابوو خودای ئاسمان هیچ نییە جگە لە یادی مرۆڤ بۆ باپیرە ئاسمانی و باڵدارەکانی خۆی. بەڵگەی دووەمیش جەمشید دەیگووت لە یاساکانی داروینەوە وەریگرتووە و ئەوەیە کە ئەگەر مانەوە بۆ باشترین و بەهێزترین بێت، ئەوا مرۆڤ بەراورد بەو دڕندە بەهێز و بێڕەحمانەی لە ناو سروشتدابوون، گەر باڵی نەبووبێت، هیچ کات باشتر و بەهێزتر نەبووە تا بمێنێتەوە. بەڵگەی سێهەمیش خۆی بوو کە بەبڕوای ئەو دەلیلێکی زیندووە بۆ ئەسڵی باڵداری مرۆڤ.

گەرچی تیۆرییەکەی مامم تابڵێی لاواز بوو، وەک سمایل دەیگووت، نەیتوانیبوو هێڵێکی ئەناتۆمی لە نێوان مرۆڤ و باڵندەکاندا بدۆزێتەوە، بەڵام ئەو ماوەیەی لە بارانۆک بردمانەسەر، بووبوو بە هەموو ژیانی جەمشید. قسەیەکیش ئەو دەم بەردەوام دووبارەیدەکردەوە ئەوەبوو کە خەفەتێکی گەورەیە ئینگلیزی نازانێت و ناتوانێت زۆر لە تیۆرەکەیدا قووڵ ببێتەوە، چونکە ڕای وابوو لە ئێستای دونیادا هەر تێکستێک بە زمانێکی ئەورووپی نەنوسرێت نرخی نییە، ڕۆژانە چەند جارێکیش دەیگووت کە ئەم زمانە خۆرهەڵاتیانەی ئێمە زمانی زانست نین، بەڵکو زمانی حوشتر لێخوڕین و هێستر بەخێوکردنن.

لەگەڵ هەوڵە زۆرەکانیشیدا جەمشید خان نەیتوانی لەو تیورەیەی خۆیدا زۆر بچێتە پێشێ، بەڵام تا دەهات فڕینی باشتر و باشتر دەبوو، ئێمەش لەگەڵ جوڵاندن و شلکردن و ڕاکێشانی پەتەکاندا ئەزموونی زۆرترمان کۆدەکردەوە. شەوێکیان بە لەیەکدانی گوریس جەمشید نزیکی سەد مەتر لە ئاسماندا بەرزبووەوە، تا زیاتریش بەرزببایەتەوە کێشی کەمتر و گرتنی ئاسانتر دەبوو، من سەرەتا وام هەستدەکرد کە خانی مامم لەوانەیە لە ئاستێکی بەرزیدا بوەستێت و بترسێت، بەڵام تا زیاتر بەرزبایەتەوە لەزەتی زیاتری لە فڕین دەبینی، پتر بای خۆشدەویست، زیاتر هەستی بە ناوازەیی خۆی دەکرد. شەوێک حیسام خانی باپیرەم و باوکم و مامە ئەدیبیشم کە بەسەردانێکی تایبەتی لە شارەوە هاتبوون بۆ لامان، لەگەڵماندا هاتن و بەچاوی خۆیان فڕینی جەمشید خانیان بینی. من لەسەر سیمای باپیرەم هەم خۆشحاڵی و هەم نائومێدیم بینییەوە، باپیرەم بەسەرێک لەوە ڕازی بوو کە کوڕەکەی دەفڕێت، بەڵام دەترسا ئەم سیفەتە هەموو شتێکی تێکبدات و تاهەتاهەتایە ڕێگربێت لەوەی ژیانێکی ئاسایی بژی. مامە ئەدیبم یەکەم کەس بوو کە زۆر پێی لەسەر ئەوە داگرت کە جەمشید نابێت بە ڕۆژ و لە ڕۆشناییدا بەنێو ئاسمان بکەوێت، چونکە خانێکی فڕیو دەشێت مایەی گاڵتەپێکردن و لاقرتی بێت، لەوانەشە ترس و سامێکی گەورە لە ناو خەڵکدا بخاتەوە و ببێتە مایەی تێکچوونی ئارامی و دروستکردنی گرفتی ئەخلاقی ئەوتۆ کە دواتر چارەسەریان ئاسان نابێت. مامە ئەدیبم گووتی «خەڵک ژن و منداڵیان هەیە و نایانەوێت کەس لەسەرەوە تەماشایانبکات». دیارە هەر زوو حیسام خانیش کەوتە سەر قسەی مامم و بڕیاریاندا من و سمایل بۆمان نییە لە ڕوناکیدا جەمشید لە بادا بەردەین و کاری وەها دوا هەڵدەبێت کە بیکەین. جەمشید لە

بەرچاوی باپیرەم بەسەر زارەکی ملی بۆ بڕیارەکان دا و گفتی بەخشی کە زۆر لە ئێمە ناکات لە ڕۆژدا هەڵیدەین و بە ئاسماندا بیفڕێنین.

لە ساڵی 1980 دا بەعسییەکان لێبوردنێکیان دایە هەموو ئەوانەی تۆمەتی سیاسیان لەسەر بوو. ڕۆژێک حیسام خان و باوکم پێکەوەهاتن و ماوەیەکی درێژ لەگەڵ مامە جەمشیددا بە تەنیا قسەیانکرد، پێشتر کەم ئاوها گفتوگۆی داخراو و نهێنیان ئەنجامدابوو، دوای چەندین سەعات گفتوگۆ جەمشید خان بە ڕوخسارێکی نائومێد و کەمێک دڵگرانەوە هاتەدەرەوە. هەڵبەت جەمشید لەو کەسانە نەبوو بتوانێت ماوەیەکی زۆر درێژ لە یەک جێگادا بمێنێتەوە، ئێمە گەرچی لە بارانۆک کێشەمان نەبوو، ئەو چەند مانگەمان بە ئارامی و بێگرفت بردبووە سەر، بەڵام خان وردە وردە خەریک بوو لە هەموو شتێک وەڕزدەبوو. دیارە هیچ مانایەکی نەبوو هەموو ژیان لەو گوندە دوور و چەپەکەدا ببەینەسەر ... بەڵام کە حیسام خانی باپیرەم گوتی لە چەند ڕۆژی داهاتوودا جەمشید خان سوود لە لێبوردنەکەی دەوڵەت دەبینێت و خۆی تەسلیمدەکاتەوە، من و سمایل بەو هەواڵە ئاسوودە و دڵشاد نەبووین، بگرە تووشی مەراق و دوودڵییەکی بەرچاو هاتین. لەگەڵ جەمشید خاندا، ژیان لەم گوندە چەپەکەدا لە شار ئاسانتر بوو، ئەوەی دەمهێنایە پێشچاوی خۆم، هەرسێکمان بە دوو پەت پێکەوە بەستراوین و بە شەقامەکانی شاردا دەڕۆین، یان چوار وەرزی ساڵ قۆڵمان لە قۆڵی خاندا دەبێت و پیاسەدەکەین، بەبڕوای من دەبووە مایەی قسەوباس و نوکتە و پێکەنینی هەموو خەڵک. لەگەڵ ئەوەشدا کەس گوێی لە ترسەکانی من نەگرت. باپیرە حیسام و پیرۆز خانی نەنکم دەیانویست چیتر کوڕەکەیان قاچاغی کێوان نەبێت، جگە لەوەی

ژمارەیەکی زۆر لە خانانی خزممان پێیان خۆش نەبوو بە هۆی جەمشیدەوە لەگەڵ دەوڵەتدا تووشی گرفت ببن.

دوای چەندین مانگ پێکەوەبوون، بەیانییەک داود خانی خزممان کە هەموو دەمانزانی پەیوەندی لەگەڵ بەرپرسەکانی حیزبی بەعسدا خۆشە، لەگەڵ باپیرەمدا هاتن بۆ بارانۆک و جەمشیدیان لەگەڵ خۆیاندا برد بۆ ئەوەی ناونوسیبکەن تا سوود لە لێبوردنەکە ببینێت. هەر ئەو ڕۆژەش دوای نیوەڕۆ ماشێنێک من و سمایلی بردەوە بۆ شار.

کە گەیشتمەوە بەردەمی ماڵی باپیرەم، وەها نامۆبووم، وەک ئەوەی چەندین ساڵ بێت کێوی بم و ئەم دیمەن و ڕوناکییانەی شار بمترسێنن، کە لە ماشێنەکە دابەزیم و تەکانم بۆ ناو تەلارەکەی حیسام خان دا، هیچم لەو کوڕە نەدەچوو کە کاتی خۆی شارم بەجێهێشت. هەستمکرد ئەوەی کە تێپەڕیوە بۆ ئەبەد تێپەڕیوە و ئەوەشی کە ڕابوردووە بۆ ئەبەد ڕابوردووە.

## لەگەڵ جەمشید خان لە مەیدانەکانی جەنگدا

جەمشید خان لە بنکەی سەرەکی ئاسایش خۆی تەسلیمکردەوە، بەڵام ڕاستەوخۆ ئازادیان نەکرد، لەوێوە پێیانگووت کە کاتی سەربازیی هاتووە و دەبێت بڕوات بۆ سوپا... جەمشید کە ئاشکرا کەڵکی خزمەتکردنی پێوەنەبوو، سەرەتا ناردیان بۆ خەستەخانەیەکی تایبەت تا بچێتە بەر پشکنین و ببینن ئاخۆ بەرگەی سەربازی دەگرێت. هەر ئەو ماوەیەی جەمشید چوو بۆ پشکنین، شەڕی گەورەی عێراق و ئێرانیش لە چەند بەرەیەکی

جیاوازەوە ئاگریگرت و هەڵگیرسا. گەر ئەو شەڕە نەبایە لەوانەبوو جەمشید بەهۆی لاوازی و بێکەڵکییەوە لە سوپا وەرنەگیرێت، بەڵام جەنگ لە هەفتەی یەکەمەوە ڕوویەکی وەها ترسناک و تاریکی هەبوو، وایدەکرد ئەو پزیشکانەی لە لیژنەی پشکنیندا دادوەرن، بە لێشاو خەڵکانی پەککەوتە، بێ دەست و قاچ، نیوەکوێر و شێت بخەنە سوپاوە. ئەو دروشمەی پزیشکە بەعسییەکان لەو دەمەدا کاریان پێدەکرد ئەوەبوو «ئەگەر ساغین یان نەخۆش، لە جەنگدا دەبێت هەموو جەنگاوەربین و خزمەت بە سەرۆک بکەین ».

دیارە باری لەش و توانای جەمشید وەها تایبەت بوو دەکرا لەگەڵ هەموو توندوتیژی ئەو یاسایانەدا کە لەخەستەخانەی سەربازی کاریان پێدەکرد، لە پشکنین دەرچێت و لە خزمەتی سەربازی ئازاد بێت. بەڵام دۆخی جەمشید بەجەشنێک دەرەباوەڕ و سەرنجڕاکێش بوو پزیشکەکانی تووشی تێڕامان و بیرکردنەوەی قووڵ کرد... کاتێک یەکەمجار بۆ پشکنین ڕووتیدەکەنەوە و لە جەستەی دەڕوانن، دەبینن لەشی ئەم پیاوە باریکە لە هەندێک جێگادا پتر وەک کاغەزی تەنک وایە و هیچی لە جەستەیەکی سروشتی ناچێت. جەمشید بۆئەوەی پزیشکەکان بخاتە سەر ئەو بڕوایەی نەینێرن بۆ سوپا، دەڵێت من مەخلوقێکی لاواز و بێجورمم و با هەمیشە لەگەڵ خۆیدا دەمبات. دکتۆرە بەعسییەکان بۆ ئەوەی لە ڕاست و دروستی قسەکانی جەمشید دڵنیابن، دەینێرن بۆ جێگایەکی تایبەت و دوای هەندێک تاقیکردنەوە بۆیان دەردەکەوێت کە مامم بونیادێکی فیزیکی دیکەی هەیە کە جیاوازە لە بونیادی فیزیکی مرۆڤە ئاساییەکان. دۆزینەوەی ئەو جیاوازییە لە بری ئەوەی دەرگای ئازادی لەسەر جەمشید بکاتەوە، بە پێچەوانەوە دەیکاتە چەکێکی سەربازی

قورس کە سوپا دەشێت سوودی لێببینێت. وەک دەڵێن فایلەکەی مامم لە چەند سەعاتێکی کەمدا لە بەر دەست وەزیری بەرگریدا دەبێت، کە بە بایەخێکی بێوێنەوە سەیری دۆخەکەی دەکات و بڕیاردەدات خۆی بە شەخسی بیبینێت.

دوای کەمتر لە بیست ڕۆژ لە دابەزینی ئێمە لە بارانۆک، جەمشید خان ڕووبەڕوو لەگەڵ وەزیری بەرگری وڵاتدا دادەنیشێت. دیارە گەر بهاتبایە و لە بارانۆک فاڵچییەک پێشبینی وەهای بۆ بکردبایانایە کە جەمشید دوای دوو هەفتەی تر لەگەڵ وەزیردا کۆدەبێتەوە، هەر سێکمان لەبەر قاقا دەخنکاین و لە پێکەنیندا دەمردین. بەڵام وەک دواتر جەمشید بۆی گێڕاینەوە، کاتێک پزیشکەکان لە توانای فڕینی ئەو دڵنیادەبن، دوای دانیشتنێکی داخراو و نهێنی لە نێوان خۆیاندا بیر لەوە دەکەنەوە کە مامم سوودی لەو فڕۆکە جەنگیانە زیاترە کە لە دوژمن وننابن و لە کاتی خۆیاندا ناگەن و کاری سیخوڕیی تەواویان بۆ ناکرێت، لە بەرئەوە هەر زوو فایلەکەی بۆ لای وەزیری بەرگری بەرزدەکەنەوە و داوادەکەن لێکۆڵینەوەی تایبەتی لەسەر تواناکانی جەمشید خان بۆ سوپا بکرێت.

وەزیر دوای ئەوەی لە باغێکی هێمندا چاوی بە فڕینی مامم دەکەوێت، پێشوازییەکی تایبەتی لێدەکات و پێیدەڵێت کە ئەو دەتوانێت سوودێکی گەورە بە هێزەکانی وڵاتەکەی بگەیێنێت. مامم جگە لەوەی خۆی خۆشحاڵ نیشانبدات چاری تری نییە، چونکە دڵنیاییە هەر هەڵەیەکی بچوک دەشێت کۆتایی بە ژیانی بهێنێت. بۆئەوەی هیچ گومانێک دروست نەکات، دەم و دەست داوای جلی سەربازی دەکات و بەدەنگی بەرز دەڵێت، بۆ خزمەتی خاکی وەتەن هیچ کەمتەرخەمییەک نانوێنم. وەزیر فەرماندەدات کە خواردن و خزمەتی تایبەتی بخرێنە بەردەست

جەمشید و شەو لە خۆشترین ئوتێلەکانی پایتەختدا شوێنی بۆ بگیرێت، دواجاریش بەرلەوەی خوداحافیزی لێبکات، پرسیاری ئەوەی لێدەکات کە چ ئارەزوویەکی تایبەتی هەیە تا دەوڵەت بۆی جێبەجێبکات. جەمشید لەویادا جگە لە من و سمایلی مامم هیچی دی بە بیردا نایەت، داوا لە وەزیر دەکات ئێمە ببین بە یاوەری و لەگەڵیدا برۆین بۆ گۆرەپانی شەڕ، بەهانەشی ئەوەیە کەسی دی وەک من و سمایل ناتوانێت لەنگەری ئەو لە ئاسماندا ڕابگرێت. بەوجۆرە من و سمایل گەرچی هێشتا کاتی سەربازیمان نەهاتبوو، لە تەمەنی شازدە ساڵییەوە بووینە یاوەری ڕەسمی جەمشید و ڕوومان لە بەرە ترسناکەکانی جەنگ کرد.

ساڵانێکی زۆر من بیرم لەوە کردەوە، ئاخۆ جەمشید خان لەسەر هەق بوو بەوجۆرە ئێمە لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ جەنگ و لەو ئاگرستانەمان بئاڵێنێت. بەڵام ئەوکات کە یەکەمجار جەمشیدم لە یەکێک لە پادگانە سەربازییە هەرە گەورەکانی نزیک بەغداوە بینییەوە بیرم لەو پرسیارە نەکردەوە، بەدڵ باوەشم پیاکرد و گووتم «وای مامە گیان چەند بیرتدەکەم». ئەو لە سەر قەرەوێڵەیەکی بەرز دانیشتبوو، کە ئێمەی بینی هەستا و گووتی «سەیرمکەن برازا ئازیزەکانم ، ژیان چۆن دەمهێنێت و دەمبات... هەر بەڕاستی بووم بە پووشی دەم با... هەر بەڕاستی». زۆرجاری دیش لە ڕەوتی ئەو ژیانە سەختەدا جەمشید بەو چەشنە دەست بەرزدەکاتەوە و ئەو ڕستەیە دووبارەدەکاتەوە. دەبێت بڵێم ئەو هەمیشە خۆی بەسەمبولی مرۆڤێک دەبینی کە ژیان یاری پێدەکات.

کە گەیشتینە ئەو پادگانە، بۆ ڕۆژی دواتر ژوورێکی تایبەتیشیان دا بە من و سمایل. ژوورەکەمان تابڵێی سادە و سەرەتایی بوو، من و سمایل یەکی قەرەوێڵەیەک و دۆڵابێک و مێزێکی بچوکمان

هەبوو. لەوێ جەمشیدیان بە «کوردە باڵدارەکە» بانگدەکرد... بۆ هەفتەیەک لەو پادگانەماینەوە تا بە بەرچاوی پسپۆڕەکانی وەزارەتەوە مەشقبکەین، بەیانیان با لە کوێ بایە، ئێمەیان سوار جێبێکی سەربازی دەکرد و دەیانبردین بۆ ئەوێ. جەمشید خان هەمیشە غەمبار لە ماشێنەکەدا دادەنیشت و دەیگووت «کوڕینا تەماشابکەن، بە چ دەردێک چووین، حاڵمان بە چی گەیشت ... وامان لێهاتووە ئێمە بەدوای بادا دەگەڕێین». هەر لەو دەمەوە زۆر بە ڕێزێکی گەورەوە ئێمەی بە عەرەبەکان دەناساند، من نەبێت مامم و سمایل هەر دووکیان عەرەبییەکی باشیان دەزانی، بەڵام من نە ئەوسا و نە ئێستاش جگە لە هەندێک وشە هیچی دی لەو زمانە فێرنەبووم. هەر کە دەگەیشتینە جێی ڕەشەبا و گەرداو دەبایە لە بەرچاوی هەندێک ئەفسەری پسپۆڕ کە لە ڕاستیدا کەسمان نەماندەزانی لە چیدا پسپۆڕن، جەمشید لە ئاسماندا بەردەین. لەو مەشقانەدا پەتی ئێجگار ئێجگار درێژمان بەکاردەهێنا کە لەسەر دوو بەکرەی گەورە و لە زیلێکی سەربازیدا لەگەڵماندا دەگەڕان. دەستخستنی پەتی وادرێژ لە بارانۆک بۆ ئێمە خەیاڵ بوو، بەڵام لە مەشقەکانی دەوروبەری بەغداددا، جەمشید چەندین کیلۆمەتر لە ئاسماندا بەرزبووەوە. فرینەکانی خان هەمووی لە چۆڵەوانیدا بوو، نەبا هەواڵی ئەم چەکە نهێنییە دزەبکات و دوژمن پێی بزانێت. پسپۆڕەکان لەگەڵ ئێمەدا پتر لەسەر ئەوە کاریاندەکرد تێبگەن ئاخۆ تا چەند دەتوانین جەمشید خان وەها لە هەوادا بجوڵێنین بگاتە خاڵێکی دیاریکراو کە پێچەوانەی ئاراستەی با بێت. دەبوو تەکنیکێک گەشە پێبدەین بتوانێت با بە هەر ئاڕاستەیەک بردی، ئێمە لەخوارەوە وەها بیجوڵێنین بگاتە ئەو خاڵە تایبەتەی پسپۆڕەکان دایان دەنا و دەیانویست بیگەنێ. لەو قۆناغەدا من و سمایلی مامە ئەدیبم تێگەیشتین کە کاری ئێمە لە خوارەوە هەم

سەخت و هەم پڕمەترسیش دەبێت، چونکە هەندێجار ناچاردەبین بۆئەوەی جەمشید بگەێنینە سەر شوێنێکی دیاریکراو، بەدەوری هێزەکانی دوژمندا پێچبکەینەوە و بچینە پشت هێڵەکانیانەوە و جەمشید لەوێوە بە هەوادا هەڵدەین. پسپۆڕەکان چەند ڕۆژێک ئەوەیان فێری مامم کرد چۆن ئامێرێکی بچوکی لاسلکی لە ئاسمانەوە بۆ پەیوەندیکردین بە زەوییەوە بەکاربهێنێت، چۆن لەسەر زەوی و لەسەر چەند تەوەرێکی خەیاڵی مەوداکان حیساببکات، چۆن لە ئاسمانەوە بتوانێت بە وردی شوێنێک لەسەر نەخشە بدۆزێتەوە، چۆن دووربینی شەوبین بەکاربهێنێت. دیارە مامە جەمشیدم پیاوێکی زیرەک بوو، هەموو ئەو شتانەی بەخێراییەکی بێوێنە وەردەگرت، بەڵام هەموو پلان و تەکنیک و فێربوونەکانیش خاڵی نەبوون لە گرفت و مەترسی گەورە. لەگەڵ ئەوەشدا من دڵنیابووم ئەفسەرە عەرەبەکان بە ڕاستی دەیانویست جەمشید بخەنە دۆخێکی ئەوتۆوە، هەم بتوانێت کاربکات، هەم بگاتە جێگای خۆی و هەم بەسەلامەتیش بگەڕێتەوە.

لەو دەمەدا وەزیری بەرگری خۆی بە نامەیەکی زۆر نهێنی سەرکردەی هەموو فەیلەقەکانی لە چیرۆکی مامم ئاگادارکردەوە، گرنگی مامم بۆ سوپا بەجۆرێک بوو، دەبوو تەنیا لە ساتی هێرش و لە دۆخی زۆر گرنگ و تەنگانەدا بیخەنەکار. هەر ئیشێکیش ئێمە و جەمشید خان تێیدا بەشداربووینایە ڕاستەوخۆ سەرکردەی گوردانە گەورەکان خۆیان سەرپەرشتیاندەکرد و دەبایە دواتریش تەواو بە نهێنی بمێنێتەوە. لەدوای هەفتەی یەکەمەوە ژیانی ئێمە گۆڕدرا. شەوێکیان زۆر درەنگ سوار ماشێنێکی سەربازیی وەک قەفەزیان کردین و بەرەو باشووری وڵات بردیانین... ئەو شەوە دەمەوبەیان گەیشتینە جێگایەکی

نەناسراو، لە دوورەوە گوێمان لە دەنگی تۆپخانەی عێراق و ئێران بوو شێتانە لە یەکتریان دەدا، بە دەنگی تۆپەکاندا زانیمان بەرەو بەرەکانی جەنگمان دەبەن. لە بەیانییەکی زوودا ئەفسەرێکی پلە باڵا پێشوازیکردین و گووتی سەر فەیلەق چاوەڕێماندەکات. سەرفەیلەق پیاوێکی خڕپلانەی کورتە بوو، دەموچاوی ئاگری لێدەباری، سمێڵێکی شۆڕ و ئەستوور هەموو دەمی داپۆشیبوو، قاچی لەسەر قاچ دانابوو و رووی پۆستاڵەکانی کە لە چەرمی قاوەیی ئەسڵ بوون کردبووە ئێمە، بەردەوام بە کلکی کورباجێکی کورت و نەخشدار و وەک جوڵەیەکی خۆنەویست دەیکێشا بە لێوانی پۆستاڵەکەیدا. بێئەوەی بۆمان پێبکەنێت یان بڵێت ئەم غەریبانە خزمەتی سوپا دەکەن، بە دەنگێکی گڕ و بێسۆز بۆ جەمشیدی روونکردەوە کە گومان هەیە سبەی شەو هێزەکانی ئێران هێرشبکەن، بەڵام ئەو هێزەی لە حوکمی پشکنینی ئەواندایە کەم و بچکۆلەیە، بۆیە دەیانەوێت دڵنیابن ئایا لە پشتەوەڕا ئێرانییەکان چییان شاردۆتەوە و چەشنی گوردانەکانیان چۆنە. ئەو گووتی، ئەوەی لە رێگای پشکنینی فرۆکەکانیانەوە پێیان گەیشتووە روون نییە، چونکە ئێرانییەکان بە رۆژ جوڵە ناکەن و بنە و تەدارەکی خۆیان بەشەو دەخەن. ئامیر رای وابوو کە دەبێت لەو رووەوە زانیاری تەواویان چنگ بکەوێت تا لەسەر ئەوە نەخشە دابنێن و شێوە و ریزبەستی هێڵەکانی خۆیان دیاریبکەن. بەپێی قسەی ئەو دەبوو ئەمشەو لەگەڵ کەوتنی تاریکیدا، جەمشید ئامادەبێت بۆ فڕین. بەپێی زانیارییەکان با لە باشووری خۆرئاواوە بەرەو باکووری خۆرهەڵات دەجوڵا، دەبوو ئێمە بە خۆمان و زیلی بەکرەکان و گروپێکی لاسلکییەوە کە بۆچەند سەعاتێک مامە جەمشیدیان فێری شفرەیەکی تایبەت کرد، چەند کیلۆمەترێکی دی بەرەو باشوور بڕۆین تا با بتوانێت مامم بەجۆرێک بفڕێنێت

بگاتە سەر ئەو جێگایەی دەبوو لە نەخشەکەدا هێزەکانی ئێرانی لێوە دیاربێت. شەو بەرەو باشوور ڕۆیشتین و لەوادەی دیاریکراودا من و سمایل پەتەکانمان لە قەدی جەمشید ئاڵاند. ئەوشەوە لە تاریکیدا هەستمکرد جەمشید دەگری، باوەشم پێداکرد و گووتم «مامە گیان، چییتە و بۆچی دەگریت ؟». جەمشید بێئەوەی بهێڵێت ئەفسەرە عەرەبەکان فرمێسکەکانی ببینن گووتی «ئیتر بە هۆی منەوە خەڵکێکی زۆر دەکوژرێن... بە هۆی منەوە منداڵی زۆر هەتیو دەبێت و دایکانێکی دوور کە من نایانناسم جگەریان دەسووتێت. من ڕۆژێک لە ڕۆژان نەمویستوە لە شەڕدا بەشداربم». سمایل گووتی «مامە تۆ یاسای بەعسییەکان دەزانیت، بچوکترین هەڵە یاخود کەمترین سوسەی خیانەت وادەکات هەر سێکمان تیربارانبکەن، لەبەرئەوە بفڕە و بیر لە هیچ مەکەرەوە». سمایل لەوەدا لەسەر هەق بوو، هەر بێمێشکییەکی تری جەمشید، بێ سێ و دوو من و سمایلی دەگەیاندە بەردەمی تیپێکی تیرباران کە لە هەموو فەیلەقەکاندا بۆ خەڵکانی ترسنۆک و خائین دانرابوون. جەمشید باوەشی بە سمایلدا کرد و گووتی «من ئینسانێکم خودا بەوە حوکمی داوم بیر لە هیچ نەکەمەوە... بەڵام نا سمایل گیان، لە ماوەی ڕابوردوودا نەمتوانی لە پشکنینە زانستییەکانمدا سەبارەت بە ئەسڵ و فەسڵی مرۆڤ زۆر بڕۆمە پێشێ، هۆکەشی ئەوەبوو کە من ئینگلیزی نازانم... ئاخ ئەگەر ئینگلیزییەکی تەواوم بزانیبایە، وەک ئەوەی ئینگلیزەکان دەیزانن، ژیانم هەمووی دەگۆڕا و دەبووم بە مامۆستا لە زانکۆ. بەڵام هەستدەکەم لە ئێستاوە ئەرکێکی نوێم بۆ نوسراوە، لایەنیکەم دەبێت ئیتر یاداشتەکانی خۆم بنوسمەوە، بەڵکو نەوەکانی داهاتوو، ئەوانەی لە عێراق و ئێراندا دوایی گەورەدەبن جارێکی تر شەڕنەکەن، ببن بە دوو میللەت یەکتریان خۆشبوێت، چونکە دەزانم من لە ئاسمانەوە لە

هەر کەس زیاتر خراپی ئەم شەڕە دەبینم». لەو ساتەدا قسە و تیژبینی مامە جەمشیدم دەستەوەستان و سەرسامیکردم، چونکە ڕۆژانی داهاتوو ئەوەیان سەلماند کە جەمشید خان لە هەر مرۆڤێکی دیکەی ئەم سەرزەمینە زیاتر وەحشەتی ئەو جەنگە دەبینێت.

ئەو شەوە لە کاتی دیاریکراودا کاتێک با بەرەو باکوری خۆرهەڵات هەڵیکرد، من و سمایل، جەمشید خانمان بەرەو ئاسمان بەردا. بای باشوور وەها خێرابوو لە چەند ساتێکی کەمدا ئەو وەک کۆلارەیەکی ڕەش لە ئاسماندا ونبوو. لە شەوانی پێشوو و لە کاتی مەشقدا مامم هەندێک لایت و تیشکی چکۆلانەی دادەگیرسان تا ئێمە بتوانین شوێنی دیاریبکەین، بەڵام ئەمشەو وەها ڕێکەوتین تەنیا بە شفرە و کۆد و ژمارە و لە ڕێگای ئەو مایکرۆفۆنە چکۆلانەی سەر کڵاوە ڕەشەکەیەوە قسە لەگەڵ خوارەوەدا بکات... من دڵنیابووم کە با جەمشیدی مامی بە ئاراستەی دروست بردوە، بەڵام شەو وەها تاریک و جلەکانی ئەو بەجۆرێک ڕەش بوون، تاکە شتێک لە جەمشیددا هەستم پێدەکرد قورسایی و جوڵەو بزێوی ئەو پەتەبوو کە با بە خێرایی لە بەکرەکان ئازادیدەکرد و مامم لەگەڵیدا بەرەو باکوور دەفڕی.

ئیتر لە شەوانی دوور و درێژی جەنگدا، لە سەرمای زستانەی بیابانەکان و لەگەرمای کوشندەی هاویندا وای لێدێت ئەو پەتە تاکە پەیوەندی و تاکە کەناڵی گواستنەوەی نەبزی جەمشید خانە بۆ ئێمە، کە جگە لە خۆی هیچ کەس نازانێت چی دەبینێت و هەست بەچی دەکات. لە ڕێگای ئەو پەتەوە دەمانزانی جەمشید خان بە ئاسمانەوە ماوە و ئەویش هەر لە ڕێگای ئەوەوە دەیزانی کە ئێمە لەسەر زەوی چاوەڕوانیدەکەین.

کاری ئەو شەوەمان لە رووی سەربازییەوە بە سەرکەوتنێکی بێوێنە دوایی هات، مامم لە باکورەوەڕا تەواوی ئەو خاڵە نهێنی و مۆڵگە شاردراوانەی ئێرانییەکانی دۆزییەوە کە دەبوو لە پەلاماری سبەیدا بیخەنەکار، ئەو شەوە لەدەمەو بەیانەوە و بەدرێژایی رۆژیش تۆپخانەکانی عێراق و فڕۆکە جەنگییەکانی سوپا ئەو شوێنە نهێنیانەیان کوتا کە مامە جەمشیدم دەستنیشانیکردبوون. ئەوە وایکرد پلانی ئێرانییەکان لەو قۆڵەوە ماوەیەکی درێژ دوابکەوێت. سەرفەیلەق بە دەسکەوتەکانی وەها خۆشحاڵ بوو دووجار باوەشی بە جەمشیددا کرد و گووتی «نیشتیمان قەرزارباری تۆیە». لەوێوە ئەفسانەی کوردە باڵدارەکە بە هەموو سوپادا بڵاوبووەوە... ڕاستییەک کە تا دەمێکی درەنگ ئێرانییەکان هەر بەیەکێک لە درۆ و خورافەتە باو و بڵاوەکانی ناو جەنگیان دەزانی.

لە هەفتە و مانگانی داهاتوودا ئێمە لەگەڵ جەمشید خانی مامەمدا هەموو بەرەکانی جەنگ لە باشوورەوە بۆ باکوور گەڕاین. بە پێچەوانەی سەرباز و ئەفسەرە ئاساییەکانەوە هەتا ڕۆژێکیش چییە پشومان نەبوو. بەردەوام لە پاسێکی بچوکدا کە خرابووە خزمەتی هەر سێکمانەوە لە نێوان فەیلەق و فەرماندەیی تیپ و بنکەی گوردانەکاندا دەهاتین و دەچووین، هەموو ئەرکەکانمان لە پێشی پێشەوەی بەرەکان و لە ئاگراویترین جێگاکانی جەنگدا بوو، ئەوە لە ڕۆژانێکیشدا کە تای پەلامار و هیستریای شەڕ تادەهات تینیان دەسەند، گوللە تۆپەکان و موشەک هاوێژە قورسەکان لە هەموو بەرەکاندا زەویان داخدەکرد و ئاسمانیان گڕ تێبەردەدا. ئێمە لەو ماوەیەدا دەیانجار کەوتینە ناو تۆپباران و پەلاماری ئەمبەرەوبەرەوە. کەم شەو هەبوو جەمشید خان نەفرێت... تەنیا لەو شەوانەدا کە با سرتەی نەدەکرد و هەوا

هیچی نەدەبزواند، بۆمان هەبوو پشوویدەین. لەو ماوەیەدا جەمشید خان بەراستی دەیویست کێشی خۆی بەرزبکاتەوە و وای لێبێت چیتر نەفڕێت، بەڵکو سوپا دەست بەرداری بێت و دەرفەتێکمان بۆ هەڵبکەوێت ڕابکەین. بەڵام نە زۆرخۆری و نە خواردنی بەردەوامی شیرینی هیچیان لە کێشی مامم نەگۆڕی کە ئاشکرا دەبوو بۆ ئەبەد وەک کەسێکی بێکێش لە سەر زەوی بژی. من لە زۆر برگەی مەترسیداری ئەو جەنگەدا لەوەدەترسام ئێرانییەکان جارێک لە جاران جەمشید بدۆزنەوە و لە ئاسماندا بیکوژن، زۆرجار بە مامم دەگووت کە ئیدی بەسە با وازبهێنێت و جارێک چاو بنوقێنێت و لە هەوادا خۆی بەردات و لێگەڕێت با بۆ کوێی دەبات بیبات، بەڵکو ئاسمان بەزەیی پێدابێتەوە و بۆ سەرزەمینێکی تر هەڵیگرێت و لەم دوو مەملەکەتە خوێنینە ئازادیبکات، بەڵام ئەو کاری وەهای نەدەکرد، چونکە دڵنیابوو گەر بەعسییەکان بە ڕازی وەها بزانن دواتر من و سمایل تیرباراندەکەن.

ئێمە و مامە جەمشیدم لە زۆربەی شەڕە گرنگەکاندا ڕۆڵمان هەبوو، کە سوپاکانی عێراق پەلاماری خورەمشەهریان دا مامە جەمشیدم شەو و ڕۆژ بە ئاسمانەوە بوو. بەڵێ لە هەندێ وێستگەی گرنگی شەڕدا کە پێویست بوو دەستوبرد بزانین هێزی دوژمن لە کوێدایە و چۆن دەجوڵێت، دەبایە جەمشید خان بە ڕۆژیش بفڕێت. پسپۆڕەکانی سوپا هەندێک جلی تایبەتیان بۆ مامم دەستەبەرکرد، کە ڕەنگیان لەگەڵ هەموو تۆنە جیاوازەکانی ڕەنگی ئاسماندا دەگونجا و پەتی وەهایان بۆ هێنابن، ئاویی و ڕوون بوون و لە هەوادا نەدەبینران. جەمشید هەرجارێک لە ئاسمان دادەبەزی یاداشتەکانی خۆی بە کوردی لە دەفتەرێکی تایبەتدا دەنوسی. ئەو لە ئاسمانەوە چەندین شاری وێرانکراوی

ئێرانی بینی، لەسەرەوەڕا دەیان هەزار لاشەی تێکەڵاوی سوپاکان کەوتنە بەردەمی، بەچاوی خۆی ئەو دڕندەیەتییەی بینی کە عێراقییەکان دەیاننواند... لەسەرەوەڕا کوشتنی هەزاران دیلی تەماشاکرد، کوچە بە کوچە لەگەڵ سووتانی خورەمشەهردا لەوێ بوو، بەسەر کێڵگە سووتاوەکانی نەوتی عەباداندا فڕی. لەو هەموو جەنگەدا، کە چەندین جار خومپارە و تۆپی ئێرانییەکان لە نزیکمانەوە ناڵەیکرد، جگە لەوەی جارێک سمایل بە کەمی زامداربوو، ئێمە هیچمان لێ نەهات. ئەوەی سەیربوو لەلام، ئەو ساردی و کەمتەرخەمی و بێبایەخییەبوو کە هەر سێکمان ڕۆژانی جەنگمان پێ بردەسەر... ئێمە وەک تیمێک کە ئیشێکی تەکنیکی بکات، وەک سێ کرێکاری گەڕۆک کە بەسەر وەحدەکاندا بۆ چاکردنی ئامێرێک یان زرێپۆشێک یان ئامێرێکی میکانیکی بگەڕێت خۆمان پیشاندەدا، ماوەی درێژ لە هیچ جێگایەک و لای هیچ تیپێک و لەکن هیچ فەرماندەیەک نەدەماینەوە. هێشتا لە جێگایەکی بەرەکانی جەنگدا ئیشمان تەواو نەدەبوو، لە جێگایەکی دییەوە بانگیاندەکردین. شەڕ بەجۆرێک بێپشوو و سنووری هەردوو وڵاتەکەش بەجۆرێک درێژ بوو کۆتایی نەدەهات، هیچ خاڵێک لەسەر ئەو سنوورە نەبوو یەکێک لە دوو سوپاکە هەوڵ نەدات لەوێوە دزەبکات بۆ سەر زەوی ئەویدیکەیان. ئێمە بۆئەوەی بتوانین بەردەوام بین هەموو هەست و بیرکردنەوەیەکمان لە خۆماندا کوشتبوو. هەندێجار بە جۆرێک ماندوودەبووین، من و سمایل لە کاتی فڕینی جەمشیدا لە خوارەوە خەومان لێدەکەوت... بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا پەتەکەی نێوان ئێمە و جەمشید لەوە کەوتبوو پەتێکی بێڕۆح و مردوو بێت و بووبوو بە کەناڵێکی ڕاستەقینەی گواستنەوەی هەست و ترس و خواستەکانیش، گەر ئێمە لە خوارەوە بخەوتباینایە جەمشید بە سروشتی گرتنی پەتەکەدا دەیزانی و

لەسەرەوەڕا توندیدەکرد و تەکانی بەخۆی دەدا تا بەئاگا دەهاتینەوە، گەر جەمشیدیش لە ئاسماندا بخەوتبایە ئێمە هەستمان پێدەکرد و وەها گوریسەکەمان ڕادەکێشا، ئەو کە زۆر حەزی لە خەوی ئاسمان بوو، بە ئاگادەهاتەوە. بەدترین ساتەوەخت ئەو کاتانەبوو کە جەمشید لە سەرەوە و ئێمەش لەسەر زەوی پێکەوە خەومان لێدەکەوت. لەوکاتانەدا زۆربەی جار دەنگی تەقینەوەیەک یان موشەکێک یان دەستڕێژێک بە ئاگای دەهێنایەنەوە، بەڵام گەر بەرەکانی جەنگ ئارامبایە ئیدی بێترس و بەراستی دەخەوتین، زۆربەی جار خەونەکانمان بێ خەتەر و بێ کێشەی گەورە تەواودەبوون. بەڵام جارێک تا ڕۆژ بووەوە، کەسمان نە ئێمە و نە جەمشید بە ئاگانەهاتین، ئیدی لەبەر ڕۆشنایی ڕۆژدا ئێرانییەکان مامە جەمشیدیان بە ئاسمانەوە بینی. ئەو خۆی یەکەمجار لە باڵاوە بەئاگاهاتەوە و توند ئێمەی ڕاتەکاند و بە خێراییەکی شێتانە دامانگرتە خوارەوە. خۆی بە چاوی خۆی سەدان سەرباز و دەرەجەداری ئێرانی بینیبوو کە لە خوارەوە سەریان بەرەو ئاسمان بەرزکردۆتەوە و بە دەم بانگی ئەلاهوئەکبەرەوە سڵاوی لێدەکەن و تەکبیر لێدەدەن. لە بەر هەر هۆیەک بێت، ئەو گوردانە ئێرانییە بە هەڵە لە جەمشید خانی مامم تێگەیشتبوون.

لەو چەند ساڵەی جەنگدا سمایل تەواو خۆی فێری ئینگلیزی کرد، هەردوو فەرهەنگی گەورەی «مەورید» و «کێمبێردج» ـی ئینگلیزی لە بەرگەوە بۆ بەرگ لە بەرکرد، زۆر شەو لە گەرمەی تۆپباران و لە ناو ئاگری موشەک وەشاندنی هەردوو سوپاکەدا، سمایل بێئاگا لە هەموو ئەو مەترسییە گەورانەی ئابلۆقەی ژیانی دەدابن، سەری بەسەر ئەو فەرهەنگە گەورانەدا شۆڕدەکردەوە و وشەی ئینگلیزی لەبەردەکرد. هەتا لە شەوانی ئاساییشدا، کاتێک

جەمشید خان بە ئەرکێکی سەربازی سەردەکەوت و خۆی دەبەخشی بە با، ئەو لە نزیک بەکرەکانەوە پەتەکەی جەمشیدی لە دەستی دەئاڵاند و بەدەستەکەی دی یەکێک لە فەرهەنگەکانی دەگرت و دەیخوێندەوە... هەر لەو ساڵانەدا فێری خوێندنەوەی ڕۆمانی ئینگلیزیش بوو، هەندێک شەو لە پاسەکەدا سەربوردی جین ئایەر یان لۆرد جیم یاخود مارتن ئیدنی بۆ دەگێڕاینەوە. من لەو چەند ساڵەدا هیچم نەکرد، تەنیا و تەنیا سەیری ئاسمانم دەکرد و بەجۆرێک لە جۆرەکان لە ڕوناکی و تاریکیدا بەدوای جەمشید خاندا دەگەڕام، هەتا کاتێک ئەو لە زەوی و لە تەنیشت خۆمەوە دەوەستا، هەر نابەخۆ سەرم بۆ بەرزایی بڵنددەکردەوە و لەدووی شتێکی نادیار کە نەمدەزانی چییە، وێڵ بووم... ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە دەتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم باوەڕناکەم هیچ ئادەمیزادێکی دی لەسەر زەوی بە ئەندازەی من سەری بۆ ئاسمان بەرزکردبێتەوە و لەو بۆشاییە بەرین و بێسنوورەی ڕوانیبێت. جەمشید زۆرجار کە منی بەو حاڵە دەبینی دەیگووت «سەیرکە... برازای ئەزیز، سەیری هیچی بکە، تا دەتوانیت لەو بۆشایی و بەتاڵییە بڕوانە، چونکە ئەو بەتاڵییەی کە مامی بەدبەختی خۆت هەردەم مەلەی تیادەکات، ئاوێنەیەکی ڕاستەقینەی پوچی ژیانمانە». جەمشید خان خۆی وەک شێت یاداشتەکانی جەنگی دەنوسی کە پێیوابوو دوای تەواوبوونی شەڕ، سمایل وەریدەگێڕێتە سەر ئینگلیزی و بنکەیەکی چاپ و پەخش دەدۆزنەوە و چاپیدەکەن. ئەوەی بەلامەوە سەیربوو، ئەوە بوو کە جەمشید لەسەرەتای نوسینی یاداشتە ڕۆژانەکانی خۆیدا هەمیشە بەوە دەستی پێدەکرد «من جەمشید خان کوڕی حیسام خان کوڕی زولفەقار خان کوڕی ئەمین خانم، کە نەسلم دەچێتەوە سەر میر و شاهانی زەند، لە ڕۆژی «ئەوەندەی ئەوەندەدا» لە ئاسمانەوە ئەم شتانەی

خوارەوەم بینی...». جەمشید هەتا لەو ڕۆژانەشدا کە فڕینی نەبوو و تەنیا چیرۆکی زیندەگی ئاسایی ئێمەی لە سەر زەوی دەگێڕایەوە، هەر بەو چەشنە دەستی پێدەکرد. وەک چۆن من تووشی ئەو دەردەبووبووم کە لە زەوییەوە سەیری ئاسمان بکەم، ئەویش بە پێچەوانەوە تووشی ئەو دەردە بووبوو لە ئاسمانەوەڕا شتەکانی سەر زەمین ببینێت. ئەو هەموو شتێکی هەر لەسەرەوەڕا دەبینی... هەتا ئەگەر لە خواریشەوە بایە.

یاداشتەکانی مامە جەمشیدم بۆ من گەلێک بەئێشبوون، گەرچی لەو چەند ساڵەدا ئێمە هەموو ڕووە تاریک و بێرەحمەکەی شەڕمان بینیبوو، بە ناو سەنگەری پڕ لاشەو و مەیدانی پڕ مین و کێڵگەی پڕ لە جەستەی هەلاهەلا و گوندی ڕوخاو و شارانی سووتاودا ڕۆیشتبووین، بەڵام گێڕانەوەکانی جەمشید وەها کاریگەربوون، منی دەگریان. جەمشید لە یاداشتەکاندا بەوردی وەسفی تابووری دیلەکان و سەرنگونیی گوردانەکان و سووتانی ڕووەک و قامیشەڵان و باغەکانی خورمای کردبوو. لە یاداشتەکانیدا هەمیشە نیگارێکی گشتی هەبوو، یان وەک سمایل دەیگووت «دیمەنێکی پانۆرامایی» دەکێشا. هەر کات سمایل وەهای بە مامم دەگووت، ئەو پێدەکەنی و دەیگووت «من شتەکان بەوجۆرە دەبینم کە خودا دەیانبینێت».

جەمشید لە یاداشتەکانیدا لەسەر ترسەکانی خۆشی زۆر دەوەستا. سامناکترین و پڕ مەترسیترین سات لە فڕینەکانی جەمشیددا بەتەنیا ساتەکانی خەو نەبوون، بەڵکو ئەو چەشنە ساتانەبوو کە لە ناکاو با دەوەستا و بێ هیچ پێشەکییەک و خاوبوونەوەیەکی کاوەخۆ لەپڕ هەوا لە شوێنی خۆی مەنگ دەبوو، ئیدی وەک هەموو شتێک کتوپڕ مردبێت، سروەیەکی بچوکیش چییە نەدەما و جەمشید خان وەک باڵندەیەکی کوژراو

لە ئاسمانەوەڕا بەردەبووەوە، ئەوە ئەو ساتانەبوو کە بە ساتی خەوتنی با ناوماندەنا. لەو کاتانەدا مەترسی ئەوە هەبوو مامە جەمشیدم ڕاستەوڕاست بکەوێتە خوارەوە بۆ ناو ئێرانییەکان، جارێک لە جاران وەهامان لێبەسەرهات و جەمشید لە بەرزاییەوە بەربووەوە و هەوڵی کێشکردنی ئێمە ئەوەندەی پێکرا لەوە بیپارێزێت بکەوێتە ناوەڕاستی ئۆردوگای ئەوانەوە... ئەو شەوە مامم کەوتە بەردەمی هێزەکان و من لە تاریکیدا دوای پەتەکەی کەمەری کەوتم و پاش سەعاتێک گەڕان بە برینداری و بێهۆشی لە نزیک ئێرانییەکانەوە دۆزیمەوە، تەنیا خۆشبەختیمان لەوەدابوو نەکەوتبووە ناو کێڵگەکانی مین و ئەودیو تەلبەندەکان و نزیک خاڵەکانی پاسکردنەوە. ئەو شەوە من بێهۆش هەڵمگرت و هێنامەوە بۆ نیشتەجێی خۆمان و لەگەڵ ئەفسەری یاوەردا، فڕانمان بۆ بەرەکانی دواوەی جەنگ. دەبێت بڵێم کە لە هەموو سوپادا تەنیا دوو پزیشک هەبوون بۆیان هەبوو تەماشای مامم بکەن و بیپشکنن، چونکە دەزگای هەواڵگری سەربازی دەیویست چیرۆکی جەمشید خان و ئەفسانەی کوردە باڵدارەکە تا دەکرێت بە نهێنی و وەک یارییەک لە نێوان هەقیقەت و خەیاڵدا بمێنێتەوە... دوای ئەوە جەمشید خان ماوەیەک لە بیمارستان کەوت، بەوەدا توانای پزیشکە عێراقییەکان سنووردار بوو، ناچار دوو گەورە دکتۆری ڕوسی هاتنەسەری. مامم لە کەوتنە خوارەوەدا سەری ئەزیەتی بینی بوو. پزیشکە ڕوسەکان لە حاڵەتی ئەو سەرسامبوون، پێشتر جۆرە کەسێکی وەها بێکێشیان نەبینیبوو کە دەیانگووت هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ پوکانەوەی کتوپڕی هەندێک ئۆرگانی زیاد. وەک ئەوەی جەستەی جەمشید ژیان بە کەمترین ئۆرگان و کەمترین وزە و سادەترین ئامێری هەناسە و هەرسەوە تاقیبکاتەوە. کە سمایل چیرۆکی ڕاستەقینەی مامە جەمشیدی بۆ ڕوسەکان گێڕایەوە،

دوو پرۆفیسۆرەکە سەریان لەقاند و گووتیان «جەستەی جەمشید خان لە زیندان وەک کەشتییەک بووە کە خەریکە نوقمدەبێت، چۆن کەشتییەوان لە ساتی مەترسیدا ناچارە هەموو باری زیادی خۆی فرێبدات، تا سووکتر سەر ئاوبکەوێت، جەستەی ئەویش لە ساتی مەترسیدا بارە زیادەکەی خۆی فرێداوە و تەنیا بەشی ئەوەی بژی و هەناسەبدات، ئۆرگانی سەرەتایی و گرنگی هێشتۆتەوە».

جەمشید دوای کەوتنە خوارەوەی سێ هەفتە بێهۆش بوو، دکتۆرە ڕوسەکان شەو و ڕۆژ بەسەرییەوە بوون، دەیانگووت ئەو بێهۆشییە دووردرێژە پێویستە تا لەشی بتوانێت پشوو بدات. لەو ماوەی بیمارییەدا بۆ یەکەمجار مۆڵەتمان لە سوپا وەرگرت و باپیرەم حیسام خان و بابم سەرفرازخان و مامم ئەدیب خان لەسەردانی یەکەمدا هاتن بۆ لامان. ئەو ماوە دووردرێژە ئێمە تەنیا لە ڕێگای نامەوە ئەوانمان لەوە ئاگاداردەکردەوە کە ماوین و ئیشوکاری سوپا ڕێگەنادات مۆڵەت وەربگرین و بەجۆرێک لە جەنگەوە ئاڵاوین دەرفەتی خەوتنیشمان نییە. تەنیا سەرفرازی باوکم باوەڕی بە نامەکان کردبوو. دوای تێپەڕینی شەش مانگ بەسەر ونبوون و بێهەواڵیماندا، هەر یەک لە حیسام خان و ئەدیب خان گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کە ئێمە کوژراوین و باشترە پرسەیەکی دەستەجەمعی بۆ هەر سێکمان دابنێن و ئەو نامانە لە چاوبەستی دۆستێک زیاتر هیچی دی نین کە دەیەوێت هەواڵی مردنەکەمان بشارێتەوە. کە حیسام خان ئێمەی بینی وەختەبوو نەماننناسێتەوە، من و سمایل هەردووکمان گەورەبووبووین و سەرما و گەرما پێستی هەڵقرچاندبووین و خۆڵ و تەپوتۆزی شەو سیمای کۆچەرییەکی عەرەبی دابووینێ کە لە بیاباندا ونددەبێت. دەمێک من لەگەڵ جەمشید خاندا چوومە

سوپاوە تەمەنم شازدە ساڵ بوو، ئێستا گەیشتبوومە هەژدە، سمێڵێکی ئەستوورم دانابوو، چاویلکەیەکی ڕەشم دەکردە چاوم و زوو زوو سەیری ئاسمانم دەکرد. حیسام خانی باپیرەش لە جاران زیاتر پیربووبوو، کە ئێمەی لە بیمارستان بینی باوەشی پیاکردین و دەستیکرد بە گریان. پێشتر کەس حیسام خانی نەبینیبوو بگری... ئەوە یەکەمجاری بوو لە هەموو ژیانیدا بە ئاشکرا فرمێسک لە چاوی بێتەخوارێ. سەرفراز خانی باوکم منی توند بە خۆیەوە گوشی و گووتی کە دڵخۆشە کوڕێکی وەها ئازا و دڵسۆزی هەیە. ئەو شەوە ئێمە مۆڵەتمان وەرگرت و لەگەڵ باپیرە و باوکم و ئەدیب خاندا بۆ هەفتەیەک چووین بۆ پایتەخت، لە ڕۆژی دوایشدا هەموو ژنانی خێزانەکە لە باکوورەوە هاتن و دوای ئەو ونبوونە درێژە بۆ ماوەیەکی کورت، من و سمایل خێزانی خۆمان بینییەوە.

دوای سێ هەفتە بێهۆشی جەمشید ئێوارەیەک چاویکردەوە و هێمن لەگەڵماندا کەوتە قسە، سەرەتا من هەستم بە گۆڕانێکی قووڵ و خێرا نەکرد، بەڵام دوایی دەرکەوت وەک چۆن جەمشید لەدوای کەوتنە خوارەوەی یەکەمی ئەوەی لە بیرچووەوە کە کۆمۆنیست بووە، ئەمجارەش نوسینەوەی یاداشتەکانی لە یادکرد و هەرگیز باسی نەکردەوە. دواتریش کە دەفتەرەکانی دەبینی، وەک پێکڕا یادگاری کەسێکی دیکەبن بە چاوێکی نامۆ سەیریدەکردن و زەردەخەنەیەکی تایبەتی دەگرت. ئیدی گاڵتەی بە هەموو ئەو نوسینانە دەهات، کە لەدەمێکی دیدا بەوپەڕی دڵگەرمییەوە نوسیبوونی.

دوای دوو مانگ دابڕان لە شەڕ، ڕۆژێک تیپێک لە دەزگای هەواڵگرییەوە هاتن و بە مامە جەمشیدیان گووت دەبێت خۆی تاقیبکاتەوە و ببینێت ئاخۆ دەتوانێت دووبارە بفرێت... ئەو

شەوە ئێمەیان بەرەو جێگایەکی باگیر برد و وەک جاران پەتمان لە جەمشید خان بەست و بەرەو ئاسمان هەڵماندا، جەمشید بە ڕاستی چێژی لەو فڕینەی خۆی بینییەوە، وەک ئەوە بوو تازە بفڕێت و یەکەمجار بێت با لەگەڵ خۆیدا ببیات... لە دوای ئەو شەوەوە ئیدی ئیشی ئاسایی ئێمە لە هێڵی پێشەوەی بەرەکانی جەنگدا دەستی پێکردەوە. گەڕانەوەمان بۆ بەرەکان هاوشانی گەرمبوون و تاوسەندنێکی گەورەی شەڕ بوو. ئێرانییەکان ئەمجارە بە تەکتیکی نوێ و میتۆدی تازەی جەنگەوە پەلاماری ئەو هەرێم و شارانەیان دایەوە کە پێشتر سوپای عێراق گرتبوونی. دوای چەند تەکانێکی گەورە، لە یەکێک لە هەفتە ئەفسانەییەکانی جەنگدا شاری خورەمشەهریان گرتەوە. ئێمە و جەمشید خان بە خەستی لە شەڕەکاندا بەشداربووین، هێرشی ئێرانییەکان وەها گەورە و فرەلایەنە و بەهێزبوو، زانیارییەکانی مامم سوودێکی ئەوتۆیان نەبوو، سوپای عێراق لە زۆربەی بەرەکانەوە کەوتنە شکان و پاشەکشە. دەرەنجامی شکست و تێکشکانەکان لەسەر مێژووی وڵات و لەسەر سوپا کوشندەبوو، سەرۆک بەدەستی خۆی دەیان ئەفسەری گەورەی تیربارانکرد. ئێمەش لە ڕیزی ئەوانەدابووین کە دراین بە دادگایەکی سەربازی، بەڵام هەر زوو دەستێکی باڵا کە گرنگی جەمشید خانی دەزانی تۆمەتەکانی لەسەر لابرد و داوای لە ئێمەش کرد دڵسۆزانە لە کاری خۆماندا بەردەوامبین.

دوای سێ مانگ لە گەڕانەوەمان بۆ شەڕ ڕوداوێک کۆتایی بە ژیانی پێکەوەیی ئێمە هێنا.

شەوێک لە هەرێمی واسیت، دەبوو کارێکی نهێنی لە ناو خاکی ئێراندا جێبەجێبکەین، فەرمان وابوو بە کۆمەکی دە کۆماندۆی تایبەت چەند کیلۆمەترێک بچینە ئەو دیو هێڵی بەرگری

دوژمنەوە. ئێمە خەبەرمان لەوە نەبوو کە ئێرانییەکان ئاگاداری هاتنی ئێمەن، چاوی خەبەرگر و چاوەدێرەکانی پێشەوە بەجۆرێک لە جۆرەکان، ئێمە و کۆماندۆکانی دیکەیان بینی بوو، بەڵام لێگەڕابوون تا دەگەینە جێگای خۆمان. ئێمە بەخەیاڵێکی بێباک و نەترس لە شوێنی مەبەستدا جەمشید خانمان بەست و پەتمان ڕاکێشا و مامم بە کاوەخۆ لە ئاسماندا بەرزبووەوە. زۆرنەبوو کە جەمشید گەیشتبووە بەرزایی خۆی کە ئێرانییەکان ئێمەیان دایە بەر هاوەن و دەستڕێژ. من و سمایل لەسەرەتادا خۆمان بە زەوییەکەوە نووسان، بەڵام یەکێک لە کۆماندۆکان کە بە ئەبو ئەیوب بانگیاندەکرد، پەتەکەی لەدەست سەندین و پەلی هەردووکمانی گرت و هاواری بەسەردا کردین کە لەگەڵ ئەودا بکەوینە تلدان، من و سمایل و ئەبو ئەیوب تا ماوەیەک هەر تلماندا، ئێرانییەکان بێوچان دەستڕێژیان دەکرد و بەخەستی هاوەنیان دەتەقاند، من بینیم یەکێک لە هاوەنەکان بەر بەکرە گەورەکە کەوت و ئەو پەتە پچڕا کە جەمشیدی بە زەوییەوە گرێدەدا... لە ناو تەقە و ئاگرباران و تلداندا سەرم بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و لە تاریکیدا جەمشیدم نەبینی.... دڵنیابووم کە با جەمشید بە ئاڕاستەی خۆرهەڵات و بەرەو ئەوبەری سنوور دەفڕێنێت، لە نزیکەوە سێبەری ئێرانییەکانیشم بەرچاوکەوت کە بەدەم تەقەوە لە ئوتومبیلەکەمان نزیکدەبوونەوە. ئەبو ئەیوب بێئەوەی لە ژیانی خۆی بترسێت، لە تاریکیدا هەستا و پاڵی بە من و سمایلەوە نا بۆ ناو دۆڵێکی بچوک و خۆشی بە ڕاکردن بە دواماندا هات و پێیگوتین لەگەڵیدا ڕابکەین... هەموو شەو ئێمە لەگەڵ ئەبو ئەیوبدا ڕامانکرد... من ڕامدەکرد و سەیری ئاسمانم دەکرد، ڕامدەکرد و سەیری ئاسمانم دەکرد... بەڵام جگە لە ئەستێرە کە بە غەمگینی دەدرەوشانەوە، چاوم بە تارمایی جەمشید خان نەکەوت.

ئەو شەوە تەنیا من و سمایل و ئەبو ئەیوب گەڕاینەوە، با جەمشیدی لەگەڵ خۆیدا بەرەو بەری ئێران برد، هەر نۆ کۆماندۆکەی دیش کوژران... ئەوە تراژیدترین شەوی ژیانی سەربازیمان بوو.

لەدەستدانی جەمشید خان لە کردارێکی وا هەڵە و بێحیسابدا، وایکرد چەند ئەفسەرێکی گەورە پۆستەکانیان لەدەستبدەن و پایەی سەربازیان دابەزێت. لەو شەوەوە تا دوو ساڵ زیاتر، هەموو هەواڵێکی جەمشید خان لە ئێمە بڕا... ئەوە گەورەترین گوررێک بوو من و سمایل تا ئەو کات لە ژیانماندا بەرمانبکەوێت. دوای ونبوونی جەمشید، من و سمایل هەر یەک بە جیا بەرەو هەرێمێک گوازراینەوە و دەبایە ئیدی هەر کەس بە تەنیا لە سوپادا ژیان بباتەسەر. دوای ونبوونی جەمشید خان، من ئارەزوویەکی ئەوتۆم نەبوو هەموو ژیانم بە سمایلەوە ببەسترێم، هەستمدەکرد ئەویش خۆشییەکی وەهای بە من نایەت بیەوێت لە هەموو کون و کەلێنێکی زەویدا لەگەڵمدا بێت. جگە لەوە لێکترازان و جودابیمان بەدەست خۆمان نەبوو، ئەوە خواستی سوپابوو کە ئیدی هۆیەکی نەدەبینی من و ئەو پێکەوەبین. ڕۆژێک لە فەرماندەی هەواڵگرییەوە بانگیانکردم و بە فەرمانێک منیان بەرەو بیابانەکانی باشوور گواستەوە، بۆ پۆستێکی بچوک لە خاڵێکی دووردەستی سەر سنووری عەرەبستانی سعودیدا، کە دەشێت بە سەد ساڵ جارێک کەسێک ڕێی تێنەکەوێت. سمایلیش لە ناوچە شاخاوییەکان و لە نزیکی سیدەکانەوە بوو بە سەرباز. ئێوارەیەک من و سمایل باوەشمان بەیەکدا کرد و وەک دوو برا جیابووینەوە و تا ماوەیەکی زۆر درێژ یەکدیمان نەبینییەوە.

من لە سەر سنوور جگە لەوەی تەماشای ئاسمان بکەم، هیچ ئیشێکی دیکەم نەبوو. پێنج سەرباز لەو بنکە دوورەدا

دانرابووین، هەر هەفتەیەی یەکێکمان مۆڵەتی وەردەگرت و دەگەڕایەوە بۆ ماڵێ. من بەڕۆژ و بە شەو سەیری ئاسمانم دەکرد و چاوەڕوانبووم با لە جێگایەکی دونیاوە جەمشید خان بەرەو ئەم بیابانە بهێنێت. زۆرجار چاوم ڕێشکەوپێشکەی دەکرد و تارمایی ئەوم لە هەوادا دەبینی، بەڵام هەمیشە توند هۆشم بە بەر خۆمدا دەهێنایەوە و دەمگووت «جوان بڕوانە کابرا... جوان بڕوانە»، ئەو کات وەهمەکانم دەڕەوینەوە و ئاسمان بە بەرینی و بەتاڵی وەک هەمیشە بێدەنگ بەرامبەرم دەمایەوە. لە مۆڵەتی یەکەممان‌دا من بەر لە سمایل گەیشتمەوە باکوور و هەواڵی لەدەستدانی مامە جەمشیدم بە ناو خزماندا بڵاوکردەوە. ئەوکاتەی من هەواڵەکەم برد، هەستمکرد جەمشید خان خۆی بەجۆرێک لە جۆرەکان لە یادەوەری زۆربەی خەڵک و ئاسیاوەکانماندا مردبوو.

من دوای شەش مانگ لەو بیابانە وەڕزبووم و بۆ هەتاهەتایە سەربازیم بەجێهێشت و هەڵهاتم. بۆئەوەی نەکەومە دەست ئەو تیپە تایبەتیانەش کە بەدوای سەربازانی هەڵهاتوودا دەگەڕان، سەرکەوتمەوە بۆ چیاکان و چوومەوە بۆ بارانتۆک.

کە ئێرانییەکان جەمشید خانیان گرت، نەیانکوشت. «جەمشید خانێکی مردوو سوودی بۆ ئێران چییە ؟» سەرهەنگ پورپاوەری وای بە مامم گووتبوو. ئێرانییەکان هەمان یارییان بە مامە جەمشیدم کرد کە عێراقییەکان کردیان، نەوەک هەر ئەوە، بەڵکو زۆرجار جلی ئیمامەتیشیان لەبەر دەکرد و لەسەر هێزەکانی خۆیان بەرزیاندەکردەوە و لە ناو سەرباز و بەسیج و پاسداراندا دەیانکردە هەڵا و دەیانگووت «ڕەزمەندگان... ڕەزمەندگان... بڕوانن، ئەوە ڕۆحیانەتی ئیمام حوسەینە، لەسەرەوەڕا دەمانپارێزێت». دیارە ئێرانییەکان لەوە دەترسان لە ڕۆژی بادا

جەمشید خان لە ئاسماندا گرێی پەتەکەی کەمەری بکاتەوە، تا بارەش ڕووەو خۆرئاوا و بە ئاڕاستەی عێراق بیفڕێنێتەوە، لەبەرئەوە پەت و قوفڵی تایبەتیان لێبەست. مامە جەمشیدم بە سەرهەنگ پورپاوەری گووتبوو «جەنگ لە هەر بەرەیەکەوە بێت بۆ من هەر جەنگە و هەر کوشتنی مرۆڤە بۆ برای خۆی، لە بەرئەوە کاری وەها ناکەم و هەق نییە لە شتی وەها بترسن». ئێرانییەکان گوێیان بەقسەکانی خان نەدابوو، بەڵام لوتفیان نواندبوو و لەسەر داواکاری خۆی دوو یاریدەدەری هەمیشەییان خستبووە خزمەتییەوە، کە ناویان «غولام ڕەزا تاهیری» و «حوسەینعەلی فەسیحی» بوو، کە دوو گەنجی خۆشڕوو دەبن، هەردووکیان عەرەبی بەباشی دەزانن و کاریان بەسەرێک قایمکردنی پەتەکان و بەسەرێکی دی وانەدادانی فارسی و ڕوونکردنەوەی خەتی ئیمامە بۆ جەمشید. ئەو دوو گەنجە جگە لە یادگاری شیرین و خۆش لای مامم هیچی دی جێناهێڵن، هیچیان شەڕخواز و فانەتیک نین، بەڵکو وەک من و سمایل وەهان، دوو قوتابی تەمەڵن کە لەو جەنگە و لەو سوپایەدا نەبێت لە هیچ شوێنێکی دیکەی دونیادا جێگایان نابێتەوە. لەگەڵ تێپەڕینی کات و بە تێکەڵبوونی بەردەوام لەگەڵ یەکدا، ئەوان زیاتر دەبنە دۆستی جەمشید و ئەویش زیاتر بڕوایان پێدەکات. ئەوان بە مامم دەڵێن لەو ڕۆژانەدا کە ئەو جلی ئیمامەت دەپۆشێت و وەک سێبەری حوسەین یان ئیمامی عەسکەری بەسەر سوپادا دەفڕێت، ئەوە گەنجانی مەزهەبدار وەها جۆش دەدات، ئیدی بە عەشقی کەربەلاوە خۆیان بە کێڵگەکانی میندا دەدەن و باکیان بە مردن نامێنێت. گەرچی ئیشەکەی مامم لای ئێرانییەکان کەمێک سادەتربوو، ئەوەی جلێکی مەزهەبی بپۆشێت و خۆی وەک ڕۆحیانەتی یەکێک لە ئیمامە گەورەکان پیشانبدات، خۆشتر و بێکێشەتربوو لە

وەزیفەکانی لە سوپای عێراقدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مامم بە چاوی خۆی دەیبینی کارە سووک و ئاسانەکەی ئەو، چی بەسەر ئەو هەموو کوڕە گەنجەدا دێنێت، کە هێندەی ئەو لە ئاسماندا دەبینن، دەگەنە یەقینێکی مەزهەبی ڕەها و ترسیان لە مردن نامێنێت. دواجار دوو یاوەرە ڕوخۆشە ئێرانییەکە، پلانێکی مەحکەم بۆ مامم دادەنێن تا هەڵبێت و بگەڕێتەوە بۆ کوردستان. بەڵام مامە جەمشیدم تا جەنگی فاوی لە ئاسمانەوە نەبینی، بڕیاری هەڵهاتنی تەواوەتی نەدا. ئەو لەو جەنگەدا تێکەڵبوون و بەسەریەکدا کەوتنی لاشەی دەیان هەزار سەربازی بینیبوو، کە ئیدی بەجۆرێک سووتابوون و تۆپ و خومپارە بەشێوەیەک هەلاهەلایکردبوون کەس نەیدەتوانی لەیەکیان جیابکاتەوە. دیمەنەکانی جەنگی فاو لە پێش چاوی جەمشید وەها ترسناک دەبن، شەوێک بە دوو یاوەرەکەی دەڵێت کە ئیتر نایەوێت چیتر تەماشای ئەم شەڕەبکات و دەیەوێت هەڵبێت و بگەڕێتەوە بۆ باکوور. لە شەوێکی بادار و لە کونجێکدا کە گێژەن زۆر دەیگرێتەوە، دوو گەنجە ئێرانییەکە دوای ئەوەی هەندێک پارە و ئەدرێسی پێویستی ناو ئێران دەدەنە جەمشید. خان تا لەسەفەری گەڕانەوەیدا نەگیرێت و بێکۆمەک نەمێنێتەوە، بە پەتێکی باریک و بێزامن مامم دەبەستنەوە و بەرەو بەرزاییەکی زۆر دوور لە ئاسماندا بەریدەدەن. لەوێ لە کەشکەشانی فەلەکدا کە جەمشید هەستدەکات گوڕمی با زۆر بەهێزە و دەتوانێت بۆ دوور هەڵیبگرێت، پەت دەپچڕێنێت و با بەخێراییەکی شێتانە ڕووەو قووڵایی خاکێکی غەریب دەیفڕێنێت و سەدان کیلۆمەتر دوور لە جەنگ لە باغێکی میوەی نزیکی ئەسفەهاندا دایدەگرێتەوە بۆ زەمین.

# حەشارەکانی بارانۆک

جەمشید خان بەسەفەرێکی درێژ و پێچاوپێچ، کە چەندەها شاری تێکەوت و چەندین هەفتەشی پێچوو، گەیشتەوە سەرسنوور و نیوەڕۆیەک لەگەڵ ولاغدارێکی ئێرانی و بە سەر هێسترێکی لەڕەوە خۆی کردەوە بە بارانۆکدا. کاتێک جەمشید خان گەڕایەوە، جگە لە من و چەند سەربازێکی هەڵهاتوو کەسی دی لە بارانۆک نەدەژیا. گوندەکە لە حیساباتی دەوڵەتدا بە چۆڵ لە قەڵەمدرابوو، هەر کات کۆپتەرە عێراقییەکانیش بەسەریدا دەفڕین بەجۆرێک خاپوور و بێژیان بوو سەرنجی ڕانەدەکێشان. ئێمە بەڕۆژ خۆمان لە دەرکەوتن دەپاراست و گەر هەستمان بە مەترسی بکردایە دەچووین بۆ چیا نزیکەکان و لە ناو درەخت و ئەشکەوت و بەردەلانەکاندا خۆمان قایم دەکرد. من لەوێ بەردەوام دووربینێکم بەدەستەوە بوو ئاسمان بەدوای جەمشیدخاندا دەگەڕام. ئەو ماوەیە لە هەر شوێنێک بوویێتم بەردەوام بەدوای مامدا سەیری ئاسمانم دەکرد، بەڵام جگە لە دوکەڵی فڕۆکە جەنگییەکان و کۆپتەر و هەندێک پۆلە باڵندەی بێئاگا هیچی تر لە ئاسماندا نەدەبینرا. کە یەکەمجار بەسەر هێسترەکەوە بینیم بەتانییەکی ئەستووری لە خۆیەوە پێچابوو و توند قاچی بە کەمەری هێسترەکەوە بەستبوو نە با بابیبات، ڕەنگی لەجاران پەڕیوتر و چاوانی خەوتوو و نەخۆش دیاربوون. سەرەتا کە منی لە نزیک مزگەوتە کۆنەکەی بارانۆکەوە بینی، وایدەزانی من تارماییەکم و لە ناو وڕێنە و خەیاڵە ماندووەکانییەوە هاتوومەتەدەرێ. تا دەستی لە دەموچاو و

جەستە و دووربینەکەی دەستم نەدا باوەڕی بە واقعییەتی من نەکرد. سەفەری نهێنی و درێژی بە ئێراندا تەواو ماندوویکردبوو، بێئەوەی هیچ قسەیەک بکات، وەک لەسەر هێسترەکەی بێهۆش بووبێت چاوانی لێکنا و بەلادا هات. من پەتەکانی قاچیم کردەوە و وەک منداڵێک هەڵگرم بە خۆی و بەتانییەکەیەوە دامگرت و بە باوەش تا ژوورەکەی خۆم هەڵمگرت و لەوێ سۆبایەکی یابانی بچوکم هەبوو، بۆم داگیرساند و خواردنم بۆ دروستکرد. لە دەمەو ئێوارەدا یەکەمجار بەتەواوی چاویکردەوە و گووتی «سالار خان، لە ئێران وامدەزانی تۆ مردویت». ئەوە یەکەمین جاری بوو لە ژیانیدا پێمبڵێت «سالار خان». ئەوەی لە جەمشیددا سەیربوو ئەوەبوو، دواهەمین کەوتنەخوارەوەی بەشی هەرەزۆری یادەوەرییەکانی سەرەتای جەنگی لە یادا سڕیبووەوە. کە چیرۆکی دواهەمین و دوورودرێژترین فرینی خۆی بە ئاسمانی باشووری ئێراندا بۆ باسکردم، ئیدی تەواو دڵنیابووم کە جەمشید هەرجارێک لە ئاسمان بەردەبێتەوە، لەو کەوتنە خوارەوەیەدا شتێک لە یادەوەرییەکانی وندەکات و گۆڕانێکی نوێ بەسەر کاراکتەریدا دێت.

دوای ئەو بەربوونەوە گەورەیەی لە دەوروبەری ئەسفەهان، جەمشید هەم لە ئاسمان و هەم لە با دەترسا.

من لەو ماوەیەدا شەوان کاتێک لەگەڵ سەربازە هەڵهاتووەکانی دیکەدا ئاگرێکمان دەکردەوە و دادەنیشتین، زۆر باسی جەمشیدخانم بۆ دەکردن. بەشی هەرە زۆریان باوەڕیان بە چیرۆکەکانی من نەدەکرد... کە خۆیان جەمشید خانیان لە ناو ئەو نوێنە گەرمەدا بینی، سەریان لە تەنکی و باریکی ئەو پیاوە سوڕما کە ئێستا نەیدەوێرا خۆی بداتە دەم با و تەنیا لە پەنجەرەی بچوکی ئەو خانووە گڵینەوە تەماشای ئاسمانی

دەکرد. ترسی جەمشید خان لە ئاسمان لە چەند هەفتەی یەکەمدا ترسێکی بێوێنە و گەورەبوو... من لەو ماوەیەدا نامەم بۆ باپیرەم نارد و هەواڵی گەڕانەوەی جەمشید و باری تەندروستی ئەوم بە درێژی بۆ نوسی. دیارە بە هۆی شەڕ و گەورەبوونی ناوچە حەرامەکان و کۆمەڵکوژییە گەورەکانی بەعسەوە پەیوەندی ئەو شاخ و دەڤەرانەی ئێمە لەگەڵ شاردا هێدی هێدی بە تەواوی دەپچڕا. لە پاییزی ساڵی 1988 دا تەنیا من و مامە جەمشید و سێ سەربازی هەڵهاتووی دیکە لە بارانتۆک مابووین، تادەهات هەلومەرجی ژیانیشمان سەختتر دەبوو. من دڵنیابووم لە چەند مانگی داهاتوودا گوزەرانمان دەکەوێتە مەترسی و تووشی کەمی بژێوی و کورتی زەخیرە دێین، خۆم چیتر ئامادەنەبووم بگەڕێمەوە بۆ سەربازی و جەمشید خانیش هەرکات باسی گەڕانەوەی ناو سوپام لەگەڵدا دەکرد، تووشی بارێکی ڕۆحی سەخت و گرژبوونێکی تەواوەتی جەستە و لەرزێکی کتوپڕ دەهات. لەو دەمەدا مامم لەوە دەترسا بکەوێتە دۆخێکی ئەوتۆوە ناچاریبکەن بفڕێت و بڕواتەوە بۆ ئاسمان.

من چاوەڕوانی شتی زۆر خراپم لە داهاتوو دەکرد، لە ئەشکەوتە نزیکەکانی دەوروبەر چەند بنکەیەکی نهێنی و تایبەتیم بۆ ساتە سەختەکان خۆشکرد، تا گەر شتی کتوپڕ ڕوویدا لێمان نەقەومێت. شەوانە کە هەموو دەخەوتن، من جەمشیدم دادەپۆشی و دەردەچووم بۆ ناو کێڵگە و باغاتی گوندە نزیکەکانی دەوروبەر کە پێکرا بە هۆی جەنگەوە چۆڵبووبوون، لەوێ دەمەو بەیانان بەر لەوەی بولێڵ بەرەو ڕوناکی تەواو وەرگەڕێت، تا هێزم تێدا بایە گوێز و ترێم کۆدەکردەوە و هەنجیر و قۆخم لە داران دەچنی، هەر شتێکیشم چنگ بکەوتبایە بەسەبەتەی گەورە دەمگواستەوە و لەبەرەوە دەکەوتمە

وشککردنەوەی میوە بۆ زستانی داهاتوو. زۆرجار غیرەتم دەدایە بەر خۆم و بەرەو گوندەکانی خوارتریش دادەبەزیم کە سەرتاپایان بەزۆر بە خەڵکی چۆڵکرابوون و ڕوخابوون، لەوێ لە ناو داروپەردووی ماڵەکاندا برنج و شەکر و چام دەدۆزییەوە و دەمدان بە کۆڵمدا و لە چەند جێگای جیاواز جیاوازدا و بەجۆرێک لە شێ و پیسی بە دوورین هەڵمدەگرتن. من سێ مانگ پتر خەریکی زەخیرەخستن بووم، چونکە دڵنیابووم گەلەک تەنیا لەو چیایانە دەمێنینەوە.

لە کۆتایی تشرینی دووەمی ساڵی 1988 دا جگە لە من و مامە جەمشیدم، تەنیا کوڕێکی دی لە بارانۆک مابوو کە ناوی ئەرسەلان شامیل بوو، ئەویش لەبەر ئەوەی زۆر کێشەی لەگەڵ باوکیدا هەبوو نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ شار. ئەرسەلان کوڕێکی منداڵکاری دەستەوەستان بوو کە خوێندکارێکی زیرەکی مەکتەب بوو، بەڵام خراپی باوکی وایکردبوو لە شار هەڵبێت و لەم شاخانەدا خۆی قایمبکات. ڕۆژێک دامنا و دۆخی خۆمانم بەوردی بۆ ڕوونکردەوە، پێمگووت دوور نییە لە زستان یان لە بەهاردا سەربازەکانی دەوڵەت بێنە ئەم نزیکانە و دەبێت ئێمە هەم بتوانین خۆمان بشارینەوە و هەم زەخیرەی تەواومان هەبێت بۆئەوەی بەرگەبگرین، چونکە ئیتر پێناچێت تا ماوەیەکی درێژ کەس بتوانێت بە فریای ئێمەبگات. بۆم ڕوونکردەوە کە من لەبەر مامە جەمشیدم نەدەتوانم بگەڕێمەوە بۆ شارەکانی عێراق و نەدەشتوانم بچم بۆ ئێران، چونکە ئەو لەدەست هەردوولا قاچاغە و کەس نازانێت گەر بکەوێتە دەستیان چارەنوسی چی دەبێت و چی بەسەردێت. دوا ئامۆژگاریشم ئەوەبوو پێیبڵێم گەر دەیەوێت تووشی ناخۆشی گەورە نەبێت باشترە بچێت بۆ ئێران، چونکە ژیان لەم شاخانەدا سەختە و زستانێکی درێژیشمان لەبەردەمدایە

کە سەرەتای دیارە و کۆتایی دیار نییە. گەرچی من زۆرم بۆ ئەرسەلان گووت، ئەو نەیبیست و هەر وای بەباش زانی لەگەڵ ئێمەدا بمێنێتەوە. ئەو کورێک بوو زۆر لە نادیار دەترسا و لە توانای مانەوەی خۆی بەتەنها بە گومان بوو.

کاتێک لەوە دڵنیابووم کە ئەرسەلان لەگەڵ من و جەمشید خاندا دەمێنێتەوە، چەند شەوێک دوو قۆڵی بەرەو ناو گوندە ڕوخاوەکان دابەزین و لە ناو وێرانە و خەراباتەکانیدا هەندێک لێفە و پێخەفی کۆن بەڵام کەڵکدارمان کۆکردەوە و لە چەند ئەشکەوتێکی جیاوازدا قایممانکردن. ئەو ماوەیە جەمشید خان زۆر بێدەنگ و بێکەیف بوو، بە ئەستەم قسەیدەکرد و بە زەحمەتیش شتی بەیادا دەهاتەوە، چەند جارێک کە باسی سمایلم لەگەڵدا کرد بە چاوە ماندوو و خەواڵوەکانییەوە سەیریدەکردم و دەیگووت «سمایل کێیە ؟». من دەمزانی مامم پێویستی بە هەوای پاک و جوڵە و دڵنیایی هەیە. ڕۆژێک خۆش بایە و ترسمان نەبایە هەڵمدەگرت و دەمخستە بەر خۆر، یان من و ئەرسەلان لە خۆمان دەبەست و بە ناو دارستان و گوێ چەم و هەندێک ڕەوەزی پاکژدا دەمانگێڕا، بەڵکو لەشی شتێک لە توانا سروشتییەکانی خۆی وەربگرێتەوە. ئێستا ترسەکەی لە با بێسنوور بوو، گەر سروەیەکیش بهاتبایە، وەها دەیترساند دەکەوتە هاوارکردن و سامێکی واش لە قریشکەیدا بوو، ناچاریدەکردین زوو بیبەینەوە ژوورێ. لە ڕۆژانی بادا نەیدەوێرا لە پەنجەرەشەوە سەیری دەرەوە بکات، لورەی با لە ژووریشەوە ترسێکی قووڵی دەنایە دڵییەوە. سامێکی دەرونی نائاسایی و خورافیانەشی تێدا سەوزبووبوو کە هەر یەک لە دەوڵەتی عێراق و ئێران بە کۆماندۆی تایبەت و هێزی گەورە بەدوای ئەودا دەگەڕێن.

زستانی ئەو ساڵ گەلێک سەختبوو، بەڵام من هێدی هێدی جەمشید خانم ڕاهێنا ترسی لە با و ئاسمان کەمتر بێت، گەرچی هێشتا زۆر لە هەورە بروسکە دەترسا، بەڵام فێرمکردەوە هەندێجار لە باراندا بێتە دەرێ و لەگەڵماندا بڕوات. ئێمە لە ناوەڕاستی پاییزەوە تەواو لە دونیا دابڕاین، من هەندێجار جەمشید خانم بۆ ئەرسەلان جێدەهێشت و سەرکێشانە دەڕۆیشتم، زۆر خولیام بوو ڕادیۆییەک پەیدابکەم و لەوێوە گوێ لە دەنگوباسی دونیا بگرین، تا تێبگەین چی لە دەرەوەی ئەم پەناگا کێوییەی ئێمە دەگوزەرێت. دوو جار لە ناو داروپەردوودا ڕادیۆم دۆزییەوە بەڵام هیچیان باترییان نەبوو. هەندێک شەو تینم دەدایە خۆم و بۆ دوور دەکەوتمە ڕێ، بەڵکو لە جێگایەکدا بگەمە ناو ئاوەدانی، دەمویست تێبگەم تا کوێ ئەم دەڤەرە چۆڵکراوە و ژیانی ئاسایی لە کوێوە دەست پێدەکات. ئێمە لە وێرانەکانی بارانۆکەوە بە تیرەی پتر لە پەنجا کیلۆمەتر جێگایەکی ئاوەدانیمان لێوە نزیک نەبوو، چەکدارەکانی دەوڵەت لە هەموو شوێنێک بوون، بەعسییەکان هەوڵێکی گەورەیان دەدا خەڵکی جووتیار لە چیاکان دووربخەنەوە. من بە دووربینەکەم سەیرمدەکرد و دەمبینی سەربازە عەرەبەکان، خەڵکی گوندە ڕوخاوەکانیان ناچاردەکرد لە تەختانی و زەوی دەشتدا شوێنی نیشتەجێی تازە بۆ خۆیان دروستبکەن. هەموو هەوڵی من بۆئەوە بوو هەواڵێک بۆ باوکم یان حیسام خان بنێرم تا بزانن ئێمە زیندووین و هێشتا لە دەوروبەری بارانۆکدا ماوین. دڵنیابووم گەر ئەو هەواڵەیان پێبگات شتێک لە کۆمەک و دەرمان و خواردنمان پێدەگەێنن. بەڵام لە هەموو دابەزینەکانمدا ڕێبوارێکی ئاسایم نەبینی بڕوای وام بداتێ هەواڵی وەهای پێدا بنێرم. من چەند سەرەڕۆ بووم، هێندەش وریا و بەپارێز بووم،

دەمزانی هەر هەڵەیەکی بچوک دەبێتە مایەی گرتن و تیاچوونمان.

لەگەڵ داکردنی بەفری زستاندا تێگەیشتم هەوڵەکانم بێمایەن و چاکترە توانای خۆم بۆ خۆپاراستن و خزمەتی جەمشید خان تەرخانبکەم. لەو دەمەدا جەنگ بەتەواوی وەستابوو و سەربازە عێراقییەکانیش لەو ناوانەدا بێترس دەهاتن و دەچوون، هەندێجار بە دووربین دەمانبینی مەفرەزەی بچوک بچوکی سوپا گەشتێکی کورتیان بە کێڵگەکانی بەردەمماندا دەکرد، کە بەفریش دەباری ئەفسەرێکی بێتاقەت لەگەڵ هەندێک سەربازدا بۆ ڕاوکردنی کەروێشک یان ڕێوی لە حەشارەکانی بارانۆک نزیکدەبوونەوە. جارجار دووربینەکەم دەدایە دەست مامم و دەمگووت «مامە تەماشابکە... تەماشای ئەو سەربازانە بکە لە بەفردا ڕاوەکەروێشک دەکەن». جەمشید خان نەیدەوێرا لە دووربینیشدا تەماشای سەربازە عەرەبەکان بکات. ئەو سەردەمە ژیانی ئەو پڕبوو لە ترس، هێندەی هەوڵمدەدا ترسی لە شتێک بڕەوێنمەوە، سامی شتێکی دی دەچووە دڵییەوە. هەندێجار لە ئاویش دەترسا و نەیدەویست خۆی بشوات، ماوەیەک نەیدەوێرا بەسەر بەفریشدا بڕوات و دەبایە زۆر لەگەڵیدا ماندووببم تا ئەو ترسەی لە دڵدا لاببەم، هەندێ شەو لە خەوی هەڵدەستانم و گوێی لە دەنگی نادیار دەبوو کە بوونیان نییە، پڵنگی خەیاڵی دەبینی پەلامارمان دەدەن، ماری درێژ کە تەنیا لە خەیاڵی ئەودا بە سەقفەکەدا دەهاتن و دەچوون، هەموو شەوێکیش بەو زستانە بەر لەوەی بخەوێت دەبایە من ناو پێخەفەکەی بپشکنم تا دڵنیابێت دووپشکی تێدا نییە.

ئەرسەلان و مامە جەمشیدم هەموو زستانیان لە یاریکردنی دۆمینەدا بردەسەر، ئەوە تاکە شتێک بوو دەیتوانی دڵی

هەردووکیان خۆشبکات و وریا بیانهێڵێتەوە. جەمشید بەجۆرێکی منداڵانە دەیویست بەردەوام بیباتەوە، بەوەدا من یاریزانێکی گەورە نەبووم، ئاسان لە منی دەبردەوە... بەڵام نەیدەتوانی وەها ئاسان ئەرسەلان بگرێت کە ئەویش بەدڵ حەزی لەبردنەوەبوو. ئەرسەلان بەهۆی سەربازە هەڵهاتووەکانی دیکەوە کە هەموو شەوگاری خۆیان بە دۆمینە رابیکردبوو، باش نهێنییەکانی گەمەکە فێربووبوو. ئەو شەوانەی جەمشید لە ئەرسەلانی دەبردەوە باشتر دەخەوت و کەمتریش منی خەبەردەکردەوە، لەبەرئەوە واماندەکرد ئەرسەلان بەر لە خەو دەستێک بە جەمشید خان بدۆڕێنێت تا من بتوانم بێگرفت بخەوم.

ئەو زەخیرەیەی بۆ زستانم خستبوو بە باشی بەشیکردین، بەتایبەت ئەرسەلان و مامە جەمشیدم زۆر کەمخۆربوون. لە بەهاری داهاتوودا ئەو هەرێمەی ئێمە بووبوو بە هەرێمێکی چۆڵ، ئەو چەند سەربازەی لەسەر هەندێک قووتەی دووریش سەنگەریان بەستبوو، لەوێ نەمان و دەوڵەت بەرەو خوار پاشەکشەی پێکردن. من لەسەرەتای بەهاردا جارێکی تر بەرەو خوار دابەزیم و دەمە و ئێوارەیەکی درەنگ جورئەتم دایە خۆم و خۆمکرد بە یەکێک لە ئۆردوگا تازەکاندا کە دەوڵەت دروستیکردبوون و لە یەکێک لە دوکانەکان هەندێک سابوون و برنج و چام کڕی، هێندە نا کە دوکاندارەکە گومانم لێبکات، خۆم وا نیشاندا کە کرێکارێکی شاریم و لەتەواوکردنی ماڵێکدا دەستبەکارم. لەو ماوەیەدا سێ جار بەو چەشنە دابەزیم و شتم کڕی. ئەو زەخیرەیەی بەو چەشنە کۆمکردەوە لەپاڵ چوالە و گژوگیای وەک کورەڵە و بەنۆڵە و تۆڵەکە و ڕزقە و پێشۆکدا تێریکردین و کێشەی خواردنمان نەما... خۆشترین کاتیشمان

دەمێک بوو کە قاچکی هەڵتۆقیوی گەورەی بندارانمان دەدۆزییەوە و لەگەڵ جەمشیددا دەمانبرژاند.

لە بەهاردا جگە لەدەنگی بروسکە کە بێئەندازە جەمشید خانی دەترسان گرفتێکی زۆر گەورەمان نەبوو، زۆر ڕۆژ ئەوم بە باوەش هەڵدەگرت و بەرەو بالآ سەردەکەوتم و لەسەر ترۆپکی چیاکانی دەوروبەری بارانۆک مامم بە خۆمەوە دەبەستەوە و سەیری سروشتمان دەکرد، هەوڵمدەدا بە کاری دیمەنی سەوز و سیحراوی ئەو جێگە بەرزانە جەمشید بخەمەوە سەر هەوای فڕین، بەڵام گەرچی جەمشید ئێستا ئەو ترسە مەزن و بێسنوورەی جارانی لە ئاسمان نەمابوو، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا نەیدەوێرا بفڕێت. ڕۆژێک کە هەوا بێسرتە و بێشەماڵ بوو، بێئاگای خۆی پەتی نێوانمانم ترازاند تا ببینم چەند دەوێرێت لە شوێنی وابەرزدا بە تەنیا بوەستێت، کە جەمشید ئەوەی بینی وەک کەروێشکێک بیبەن بۆ سەربڕین زریکاندی، ڕەنگی بەجۆرێکیش سپی بوو خەریکبوو لە هۆش خۆی بچێت، من خێرا توند پەتەکەم گرتەوە و لە کەمەری خۆمم گرێدا... بەڵام ئەو ڕوداوە تا ماوەیەک بڕوای جەمشید خانی بە من لەقکرد و تا هەفتەیەک بە دەنگی بەرز تۆمەتی ئەوەی دەدایە پاڵم کە دەمەوێت بیکوژم، دەگریا و خۆی وەک بێکەسێکی بەدبەخت دەخستەڕوو کە لەم سەر زەمینەدا کەسی نییە. دەستی بەرزدەکردەوە بۆ ئاسمان و دەیگووت «ئێستا بشگەڕێمەوە بۆ لای حیسام خانی باوکم، تەسلیمی دەوڵەتم دەکاتەوە... خودایە بۆ کەسێکی ئیفلیج و کەساسی وەک من لەم سەر زەوییە جێگام نابێتەوە، بۆ ... بۆ دڵسۆزێکم نییە؟». من ئەو قسانەی مامم زۆر برینداریدەکردم، بەتایبەت من بەشی هەرە زۆری ڕۆژانی گەنجی خۆمم لەگەڵ ئەودا بردبووە سەر و دەمزانی گەر من نەبم

هیچ ئادەمیزادێکی تر ناتوانێت لەو تێبگات و بیپارێزێت. ڕاستە من ساڵی یەکەم هەموو شتێکم لە بەرخاتری سەرفراز خانی باوکم دەکرد، بەڵام دواتر جەمشید خانم خۆشویست و بۆ خۆی و لەبەر خۆی لەگەڵیدا بووم. بەڵام مامم هاواریدەکرد و دەیگووت دەبێت من سوپاسی ئەو بکەم، گەر ئەو نەبایە، من وەک سەربازێکی ئاسایی ئێستا یان گۆڕیشم نەمابوو یاخود لای ئێرانییەکان دیل بووم... مامم بەدرێژایی هەفتەیەکی بەردەوام لەو قسانەی پێدەگووتم و لە نانی دەستی نەدەخواردم و لەگەڵمدا نەدەهاتە دەرێ.

ڕۆژێک، لە کاتێکدا لە بەیانییەوە خەریکی چیلکە کۆکردنەوە و ئاگرکردنەوە بووم، کە گەڕامەوە بۆ کونجەکەی خۆمان مامم وەک هەمیشە تانەبارانی کردم، ئەو قسە توندانە وەها ئازاری دام، بە بێدەنگی چوومە سەر بەردێک و دەستمکرد بە گریان. ئەرسەلان کە لەسەرەتاوە ئاگای لە هەموو شتێک بوو، گەلێک دڵی بە من سووتا و بێئەوەی گوێ لە تکای من بگرێت، چووە ژووری بۆ لای جەمشید خان «کە بەتانییەکەی لە خۆیەوە ئاڵاندبوو و خەریکی مێوژ خواردن بوو» و پێیگووت «تۆ کەسێکی خۆپەرستیت، سالار خان هەموو ژیانی خۆی بۆ خزمەتی تۆ تەرخانکردوە، جگە لە باشەی تۆ هیچ شتێکی تری لە خەیاڵدا نییە، بەڵام تۆ هەفتەیەکە بێوچان دڵشکاوی دەکەیت و لە ناهەق تانەی تێدەگریت، ئیتر بەسە من لەمڕۆ بەدواوە دۆمینە لەگەڵ تۆدا ناکەم». ئەو قسە توندانەی ئەرسەلان مامی گۆڕی و کەمێک هۆشی هێنایەوە سەر و بە ساردییەکەوە کە نیشانەی شەرمێکی قووڵ بوو داوای لێبوردنی لێکردم.

لە هاویندا ڕۆژێکی گەرم، دوو گەنج لەوانەی لە ساڵانی ڕابوردوو و لە کاتی هەڵهاتندا خۆیان لە بارانۆک حەشاردابوو، دیسانەوە

دەرکەوتنەوە و خەبەری ئەوەیان بۆ هێنایین کە سەددام حوسەین دووبارە لە باشوورەوە خۆی لە جەنگێکی دییەوە ئاڵاندوە. ئەوان بەر لەوەی بگەنە بارانۆک، غەمی خۆراکیان خواردبوو، کەسێکی نزیکیان کە هەم کاری بۆ ئەوان و کاری بۆ دەوڵەتیش دەکرد، لە بنەیەکی دیاریکراودا مانگانە زەخیرەی بۆ دەخستن و ئێمە بە شەو دەچووین دەماندا بە کۆڵماندا و بەرەو حەشارەکان سەرماندەخست. من ڕۆژێک ڕوخسەتم لەو دوو گەنجە خواست و لە بنکەی ناوبراودا کە دۆستە دڵسۆزەکەیان ئازوقەی تیادەخست، نامەیەکم بە ناونیشانەوە بۆ حیسام خانی باپیرەم نوسی و هەواڵی خۆمانم لەو ماوەیەدا بۆ بەیانکرد و بێئەوەی ناوی جێگاکەمان ئاشکرا دیاریبکەم، تێمگەیاند کە ئێمە هەمیشە هەر لە بارانۆکین و لەو چیایانەدا دیلین. شەوێکی دی کە چووینەوە بۆ هێنانی زەخیرە و سەرخستنی ئەو پێداویستیانەی لەوێ گەنجینە دەکرا، بینیم نامەکە براوە. نایشارمەوە، ئەوە زۆر شادیکردم و دڵم کەوتە لێدان بۆ ئەو ڕۆژەی کەسێکی دۆست دەردەکەوێت و دێت بە هانامانەوە و هیچ نەبێت کەمێک پارە و دەرمانمان بۆ دەهێنێت.

دوو مانگ دوای ئەوە ڕۆژێک بە دووربینەکەی دەستمەوە لەسەر بەردێک، لە بەر بای ساردی سەرەتای پاییزاندا دانیشتبووم کە لە دوورەوەڕا ڕێبوارێکم بینی بە یەکێک لە تولەڕێ چەپەک و عاسییەکاندا بەرەو بارانۆک تەکان دەدا، گەنجێکی باریک و ماندوو بە چاویلکەیەکی گەورە و کۆڵەپشتێکی قورسەوە کە پێدەچوو لە ژێریدا بناڵێنێت، هێشتا ماوەیەکی مابوو بگاتە لێوانی وێرانەکانی بارانۆک کە من ناسیمەوە، سمایلی ئەدیب خان بوو کە بەپێ لە قاچاغەڕێیەکەوە بەرەو لای ئێمە دەهات...

ئەوە لای من وەک دابەزینی سوپایەک لە فریشتە وەها بوو.

سمایل لەو ماوەیەدا بووبوو بە گەنجێکی دەموچاو باریکی چاویلکە لە چاو، بە سمێڵێکی زۆر تەنک و نیگای کەسێکی خۆشباوەڕەوە کە بە هەموو گفتێک و چیرۆکێک باوەڕدەکات. لەو ماوە درێژەدا چەندە هەوڵی دابوو، باوکی نەیهێشتبوو لە سوپای سەدام حوسەین هەڵبێت. ئەدیب خان تا بڵێی باوکێکی بێڕەحم و بەجەبر بوو، کەسێک بوو نەیدەویست منداڵەکانی گرفتی بۆ دروستبکەن، لەسەر ئەو ئیمانەش دەژیا کە دەسەڵاتی سەدام حوسەین ئەبەدییە و هەر هەوڵێکی بەرگریکردن بە شکست دوایی دێت، ئەو ئەگەرچی وەک هەر کوردێکی دیکە ڕقی لە دیکتاتۆر بوو، بەڵام ڕای وابوو کە چاکترە خەڵکی لەگەڵیدا بڕۆن و ململانێی لەگەڵدا نەکەن، تا کەمتر بەهانە بدەنە خوێنڕێژی و وێرانکارییەکانی. ئەمجارە سمایل دوای ئەوەی نامەکەی منی خوێندبووەوە، بڕیاریدابوو بێئەوەی گوێبداتە قسەی ئەدیب خان، خۆی بگەێنێتە بارانۆک و بگەڕێتەوە بۆ لای ئێمە. دیمەنی ڕیشن و کێویانەی من و جەمشید، سمایلی سەرسامکرد، تا نیگای خۆمان لە چاوی ئەوەوە نەبینی نەمانزانی لەو ماوە درێژەدا چۆن بووینەتە کەسانی شێوە دڕندە و ڕوخسار کێوی. سمایل نەیدەزانی ئەو ساڵ و نیوەی دوایمان لە چ ترس و دەردیسەرییەکی گەورەدا بردۆتەسەر. گەر سەختی و قایمی حەشارگەکانی بارانۆک نەبایە ئێمە لە مێژبوو تیاچووبووین.

هاتنی سمایل دۆستێک و هاویادێکی گەورەی بۆمن زیندووکردەوە، سمایل جگە لە کۆمەڵێک کتێبی ئینگلیزی، پارەیەکی باش و هەندێک دەرمانی گرنگ و ڕادیۆیەکی نوێ و پاتری زۆری لەگەڵ خۆیدا هێنابوو کە دەیگووت تا قیامەت بەشماندەکات.

ئەو چەند مانگەی دواتر، تادەهات دەوڵەتی عێراق لە باشوورەوە پتر لە ئەگەری جەنگەوە دەناڵا، لەبەرئەوە ڕۆژ دوای ڕۆژ دەستی

لەسەر ناوچە شاخاوییەکانی باکوور شلتر و لاوازتر دەبوو. هێدی هێدی لەو ناوچانەی ئێمەدا تاکە تاکە سەربازی ڕاکردوو دەرکەوتنەوە کە دووبارە لە ترسی شەڕ بۆ پەناگایەک دەگەڕان. زۆربوونی ڕاکردوەکان هەم مایەی خۆشحاڵی بوو، چونکە هاودەمی بۆ ئێمە دروستدەکرد، هەم مایەی وریای و دوودڵیش بوو، چونکە سەرنجی دەوڵەتی پتر بەرەو ئەم چیایانە ڕادەکێشا. بەڵام جەمشید خان هەر لەیەکەم ڕۆژەوە کۆبوونەوەی دووبارەی هەرسێکمانی لە بارانۆک بە نیشانەیەکی شووم و ئاماژەیەکی گەورە بۆ سوڕی خراپ و ئەبەدی بەدبەختییەکان لەقەڵەمدا. من وام دانابوو کە بینینی سمایل تینێک بە جەمشید ببەخشێتەوە، بەڵام دوای هاتنی سمایلیش هیچ نیشانەیەک لە جەمشیددا دەرنەکەوتەوە کە بیەوێت بفڕێت و جارێکی دی جیهان لە ئاسمانەوە ببینێت. من و سمایل زۆربەی کاتەکەمان بە باسکردنی یادی دێرین و سەربوردی ڕۆژانی شەڕ و گێڕانەوەی چیرۆکە کۆنەکانی منداڵی دەبردەسەر. پێموایە لەوسەردەمەوە جەمشید دەرگای دونیای خۆی لە ئێمە داخست و ئیتر تا ماوەیەکی درێژ نەیکردەوە... زۆر کەم قسەی لەگەڵدا دەکردین، وەک غەریبەیەک لەگەڵماندا دەژیا و وەک غەریبەیەک سەیریدەکردین. بەڵام لەگەڵ ئەو نیگار و ڕەفتارەشدا جەمشید خان لای ئێمە هەمیشە هەر ئەو پیاوەبوو کە دەبایە لە باو و لە دونیا و لە خۆی بیپارێزین، بێئەوەی گوێبدەینە هەست و هەڵوێستە سەیرەکانی. ئەو چەند مانگەی دواتر گەلەک خێرا تێپەڕین... هەموو چاوەڕوانی شەڕی نوێمان دەکرد، سمایل گوێی لە هەواڵەکان دەگرت و بۆی وەردەگێڕاینە سەر کوردی. هەموو جارێک دەیگووت «دیکتاتۆر حەوت ڕۆحی هەبێت، یەکێکیان دەرناکات، تازە تەواو هەموو دونیا دژی سەدام حوسەین هەستاوە، ئەمریکییەکان، ئینگلیزەکان، هەتا ئەڵەمان و

یابانییەکانیش... مامە ... مامە جەمشید ئەمە دوا ساڵی دیکتاتۆرە، پێبکەنە و دڵخۆش بە».

## گەڕانەوە بۆ شار

جەمشید خان رای وابوو کە دیکتاتۆرەکان وەک قەقنەس وان، نامرن، بەڵکو بۆ چەند ساتێک دەبنە خۆڵەمێش و دواتر لە خاشاکی خۆیاندا هەڵدەستنەوە. ئەو ترسەی جەمشید خان وایکرد ئێمە تەنیا دوای شەش مانگ لە ئازادبوونی هەموو شارەکانی باکوور لە دەست سەدام حوسەین بگەڕێینەوە بۆ ناو خەڵک و ئاوەدانی. جەمشید باوەڕی وەهابوو سەدام حوسەین و سێبەرەکانی لە جەهەنەمیشەوە بێت دەگەڕێنەوە بۆئەوەی تۆڵەمان لێبکەنەوە، بەڵام دواجار گوشاری زۆری حیسام خانی باوکی دڵنیایی پێبەخشی و هێنایەوە بۆ شار.
گەڕانەوەمان بۆ ماڵ بێدەنگ و هێمن تێپەڕی. وەک لەوێدا پەیوەندی ئێمە و مامم کۆتایی هاتبێت، لە بەردەرگای ماڵی حیسام خان خوداحافیزییەکی گەرمی لێکردین و ئەو هەستەی بە من و سمایل بەخشی کە چیتر نایەوێت هاوکاری بین. هەر لە ڕۆژی یەکەمیشەوە گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی لە قاتی سەرەوەی ماڵی باپیرە کە زیاد لە دوازدە ساڵ بوو جێیهێشتبوو. ئیدی وەک ساڵانی زوو لە ئێمەی حەرامکردەوە لە دەرگای ئەو ژوورە نزیکببینەوە، ئەو تەنیا جارەی من بە دزییەوە و لە کاتی خەوتنی ئەودا نیگایەکم لە ژوورەکەی گرت، هەمان شێواز و دیکۆری هەبوو کە لەوەوبەر بۆی دارشتبوو، جگە لە وێنەکانی مارکس و ئەنگلز کە چیدی بە دیوارەکانەوە نەمابوون، شتەکانی دی هەموو وەک خۆیان بوون. گۆڕانێکی سەیر کە لە شار بەسەر

مامە جەمشیدم هات ئەو مەیل و ئارەزووە سەیرەی بوو بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ خانماندا. جەژنێک کە لە میوانخانە گەورەکەی باپیرەدا لە دەستێک جلی کوردی و بە مشکییەکی گەورەوە بینیم، پێیگووتم، ئەو لە سیازدە ساڵی رابوردوودا هەموو ژیانی بە هەموو چرکە شاد و ترسناکەکانییەوە لە ناو پیاواندا بردۆتە سەر، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئاڕاستەیەکی نوێ بدات بە زیندەگی و کاتی خۆی بۆ گوێگرتن لە ژنان تەرخانبکات، کە تاکە مەخلوقاتی دونیان ئەوە دەهێنن پیاو کاتیان لەگەڵدا بباتەسەر.

ئەوەی جێگای باوەڕنەبوو ئەوەیە کە جەمشید خان سیحرێک و درەوشانەوەیەکی وەها گەورەی لای ژنان هەبوو ئێمەی پیاوانی ساغ و سەلیم بە خەونیش نایگەینێ. من کە سەرەتای هەرزەکاریم خانمبازێکی لێوەشاوە بووم و بەبێ زەحمەتێکی زۆر دەمتوانی ڕێگا بۆ دڵی کچان بدۆزمەوە، ئێستا دوای دابڕانی زۆرم لە ژیانی شار و کێوی بوونی دووروودرێژم لە چیاکاندا، تەواوی ئەو هونەرەم لە یادکردبوو. ئەو هەوڵە کەمانەی دوای گەڕانەوەم بۆ دەستخستنی خانمان دەمدا، بە دۆخی کۆمیدی و تێکەوتنی نابەجێ و هەڵوێستی حەیابەر تەواودەبوون. بەرابەر بەو ناکامییە بەردەوامانەی من، ژوورەکەی جەمشید خان بەردەوام پڕبوو لە خانمانی جۆراوجۆر، ئیدی لە کیژانی خزم و دراوسێوە بیگرە تا چەندین خانمی نەناس کە بەجۆرێک لە جۆرەکان بە هۆی خوشک و پور و خاڵۆزا و ئامۆزاکانمانەوە جەمشید خانیان دەناسی. ئەو هەموو کچە ناسیاوەکانی دەوروبەری خۆمانی بەکاردەهێنا تا لە ڕێگای ئەوانەوە بگات بە کچی تر، من ڕام وابوو، کە سەرکەوتنەکانی جەمشید خان لە داگیرکردنی مەملەکەتی ژندا، دەگەڕێتەوە بۆ تەکتیکە ورد و مەکربازییە گەورەکانی، بەڵام سمایل دەیگووت کە لاوازی و

بێجورمی خان و ئەو دیمەنە کەساسەی هەر لەسەرەتاوە دەیبەخشێت وادەکات ژنان بڕوایەکی زۆری پێبکەن و سۆز و بەزەیی گەورەیان بەرامبەری هەبێت. بەڵام جگە لەوانەش من هەمیشە جۆرە درەوشانەوەیەکی نهێنی و شێوە ناسکییەکی دڵڕفێنم لە جەمشیددا دەبینی کە بۆ چاوی ئێمەی پیاو بینینی ئەستەم بوو، بەڵام ژنان بە تێبینییە تیژ و نیگا وردەکارەکەیان دەیانتوانی ببینن و خۆشیانبوێت. من هەر وەختێک بچووبامایەتە ماڵی باپیرە دەمبینی کە ژوورەکەی جەمشید لە ئافرەت جمەی دێت، کە پێکڕا پێدەکەنین و جگەرەیان دەکێشا و بەدەنگی بەرز قسەیاندەکرد. هەندێک جار مەراق دەیگرتم و لە گۆشەیەکدا دەوەستام و دەمبینی کە کچانی زۆر ناسک و نەناس کە نەمدەزانی لە کوێوە دێن و چۆن جەمشید دەناسن لە ژوورەکەی دەهاتنەدەرێ... کچان لە هەموو چینەیەک ، لەوانەی کە بە پانتۆڵی تەسک و تەنورەی کورتەوە هاتوچۆدەکەن، تا کیژانی حیجاب بەسەر. دواتریش سەرم سوڕما کە داپیرەوە پێیگووتم جەمشید خۆی کردۆتە مامۆستا و لە ژوورەکەی خۆیدا لە قاتی سەرەوە وانەی تایبەتی عەرەبی دەڵێتەوە. سەیر لەوەدابوو، من دوای پرس و گەڕانێکی ورد بۆم دەرکەوت ئەو قوتابییە کچانەی وانەی عەرەبی لای مامم دەخوێنن بەجۆرێکی بەرچاو لەو مادەیەدا چوونەتە پێشێ کە جێگای باوەڕ نییە.

«تێکەڵبوونی بەردەوام لەگەڵ ئافرەتدا، هێز دەبەخشێتە پیاو» ساڵانێک دوای ئەوە لە جەنگەڵێکی گەورەی نزیک دەریا و لە ناو غوباری خاکێکی دوور و غەریبدا وای پێگووتم. جەمشید لەو ماوەیەدا کە خۆی لە دونیای پیاوان دابڕیبوو و وەک جیهانێکی نزم و نەویتر سەیریدەکرد، بووبوو بە کەسێکی بەهێز ڕۆژێک بە سمایلی گووتبوو «گەورەترین هێزێک پیاوان لەم مەملەکەتە مەلعونەدا بیگەنێ، ئەوەیە لە ژنان نەترسن» جەمشید لەو

ماوەیەدا بەسەر زۆر لە ترسەکانی خۆیدا سەرکەوتبوو، کەم کەم لە ڕۆژانێکدا کە هەوا تەواو بێجوڵە بوو دەهاتە دەریشەوە و لە بەردەرگا یان لە باڵکۆنی سەرەوەی ماڵی باپیرەمدا دەوەستا. لەو ماوەیەدا چەندجارێک بە کۆمەکی دوو کچی پورمان کە بە دوو پەت وەک ئێمە لە کەمەرەوە دەیان بەست لە هەندێک سەیرانی خێزانی و چوونەدەرەوەی دەستەجەمعیشدا دەرکەوت. تا ئەوکات لە شاردا کەس بەبەربڵاوی چیرۆکی فڕینی جەمشید خانی نەدەزانی... هەر لەو دەمەدا جەمشید فێری گەڕانی ناو شار و پیاسەی ئێوارانی شەقامە درێژەکان و گەشتی بناری چیاکان بوو، هەڵبەت ئەمانە هەمووی لە ئوتومبێلدا، چونکە جورئەتی نەگەیشتبووە ئەوەی تەواو بە ئاشکرا بە خۆی و پەتەکانییەوە لە ناو خەڵکدا دەربکەوێت. ئەوکات باپیرم ئوتومبیلێکی بۆ کڕیبوو کە شۆفێرەکەی «خەزاڵ خان» ـی خوشکی سمایل بوو. زۆربەی ئێواران خەزاڵ کە تازە مۆڵەتی شۆفێری وەرگرتبوو، مامە جەمشیدی دەخستە پێشەوە و پۆلی کچی دەخستە دواوە و بە هەموو شاردا دەگەڕان. من لە کاتی گەڕانی ئێوارانداا لەگەڵ هەندێک هاوڕێی کۆندا چەند جارێک ڕێکەوتی ماشێنەکەی جەمشید خانم کرد کە هەمیشە خۆی بە قنجی لە پێشەوە دادەنیشت و سەیری شەقامە جەنجاڵ و شۆستە پڕەکانی شاری دەکرد.

جەمشید خان لە یەکێ لەو ئێوارانەدا سافینازی سدیق پاشای بینی و عاشقی بوو.

جەمشید کە بەو شێوە سەرپەرە تێکەڵ بە دونیای خانمانی شاربوو، لە نیهانی دڵدا ئومێدی بەوە بوو، عەشقێکی گەورە بدۆزێتەوە. گەرچی قوتابخانەکەی خان پڕبوو لە کیژی ناسک، لە

خزمانی دەورووبەری خۆشماندا کچی جوان و قەشەنگ گەلێک زۆربوون، کەچی با دڵی ئەوی بۆ یەکێکی دیکە برد.

ئێوارەیەک خەزاڵی ئەدیب خان بۆ کڕینی کیلۆیەک دۆندرمە لە بەر دوکانێکی بەناوبانگی دۆندرمەسازیدا ماشێنەکەی دەوەستێنێت. خەزاڵ لە بەر دوکانەکەدا کۆنە هاوڕێیەکی خۆی دەبینێت کە ناوی سافیناز خانە... بەدەستووری کچان یەکتری ماچدەکەن و دوای گلەیی ژنانە لە یەکتر، خەزاڵ پێشنیاری ئەوە بۆ سافیناز دەکات کە بیگەێنێت بۆ ماڵەوە، چونکە ماشێنی پێیە و جگە لە مامە جەمشیدیش کەسی دی لەگەڵدا نییە. ئەو سەرکەوتنەی سافیناز بۆ ناو ماشێنەکە، ژیانی جەمشید دەگۆڕێت و دەمودەست لەویادا عاشق دەبێت، عەشقێکی وەها، وەک با ئێمەش لەگەڵ خۆیدا دەبات.

گەر سافیناز نەبایە، دڵنیابووم مامە جەمشیدم جارێکی دی بیری لەوە نەدەکردەوە بفڕێت. بەڵام عەشق وا لە مرۆڤ دەکات هەموو توانا نهێنییەکانی خۆی دەربخات و چ هێزێکی هەیە بۆ سەرسامکردنی مەحبوبە بیخاتەکار.

دوو شەو دوای ئەوە مامە جەمشیدم، خەزاڵ بانگدەکاتە ژوورەکەی خۆیەوە و پێیدەڵێت «تازە عاشق بووم، وەک گەمژەیەک.. ئا وەکو گەمژەیەک. باشترین عاشقی دونیاش کەسێکە وەک گەمژە عاشق بێت». جەمشید بە وردی دۆخی بێخەوی و حەیرانی خۆی بۆ خەزاڵی مامە ئەدیب باسدەکات و دەڵێت کە ئێستا جگە لە بینین و دانیشتن و نانخواردن لەگەڵ سافینازدا هیچی دیکەی ناوێت و خەیاڵی تر لەسەریدا نییە. خەزاڵ گەرچی ئەوە بۆ جەمشید خان ڕووندەکاتەوە کە ئەم خانمە کچێکی وەها نییە جێگای بڕوا بێت و پێشتر چیرۆک و حیکایەتی زۆری لە دوایە و ناوبانگی ژنانی تایەفەی سدیق پاشا

بە گشتی باش نییە و هەر زوو زوو کەتنێکی گەورە لە یەکێکیان دەقەومێت. بەڵام جەمشید خان گوێی خۆی دەگرێت و دەڵێت «وەک گەمژە عاشق بوون، یەعنی گوێ نەگرتن لە هەموو خراپەکانی مەحبوبە». جەمشید خان، خەزاڵی مامە ئەدیب دەخاتە ژێر گوشارێکی زۆرەوە و بە شێوازە دێرینەکەی خۆی دەگری و دەڵێت «سەیری مامە بەدبەختەکەت بکە، هەموو ژیانی گەنجیم لە جەنگدا بردەسەر. سەیری داماویم بکە، بزانە کەسی تر لەم دونیایەدا وەک تۆ مامی وا کەساسی هەیە... ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، نەگبەتترین پیاوی دونیا، سووکترین پیاوی دونیا کەمێک بحەسێتەوە، خێزانێک دروستبکات، لەوانەشە لە داهاتوودا منداڵم ببێت کە وەک خۆم با لەگەڵ خۆیدا بە هەموو لایەکدا بیانبات، پێمبڵێ ئاخۆ ناتەوێت ئەم مامە بەدبەختەی خۆت لەماڵی خۆی و لەگەڵ خێزانی خۆیدا ئاسوودە بێت و دواجار ڕۆژێک بە بەختەوەری ببینیت ؟»

ئەو قسانە وا لە خەزاڵ دەکات دڵی بۆ مامە جەمشید بسووتێت و کۆمەکی پێبکات.

بۆ ڕۆژی دوایی خەزاڵ داوەتێکی گەورە بۆ سافیناز دەکات، کە تەواوی مەسرەفی داوەتەکە لەسەر حیسابی جەمشید خان دەبێت. سفرەکەی جەمشید خان پڕدەبێت لە خۆشترین ئەو خواردنانەی کە لە بەناوبانگترین چێشتخانەکانی شاردا دروستدەکران، لە ناودارترین کەبابخانە کەباب و لای ناسراوترین جگەرچی جگەر دەهێنرێت. لای لێزانترین چێشتکەریشەوە خواردنی جۆراوجۆر بە مەنجەڵ تا ماڵی ئەدیب خان قەتارەدەبەستن و بە کۆمەکی ئاشپەزێکی ئێرانیش کە نوێ هاتۆتە شار، چەند تەرزە چێشتێکی تامدار و بە دیکۆر لەسەر سفرە ڕیزدەکرێت. خانمی سافیناز هەر چاوی بەسفرەکە

دەکەوێت تێدەگات ئەمە داوەتێکی ئاسایی هاوڕێیەک نییە، بەڵکو بەیانکردنی خۆشەویستی و سفرەی دەرخستنی نیازێکی نێرانەیە، بەوەدا مێزە گەورەکەش جگە لە جەمشید خان و خەزاڵ کەسی تری لەسەر نییە، سافیناز کە لە خوێندنەوەی عەقڵی پیاودا داماو و دەستەوستان نییە، ڕاستەوڕاست لە هەموو شتێک تێدەگات و پێدەچێت هەر لەوێشدا پلانی داهاتووی خۆی داڕشتبێت.

ئەو ڕۆژە جەمشید خان تا ئێوارە لەگەڵ سافینازدا دەباتەسەر، خواردن دێت و خوادن دەڕوات، قاپە شیرینی دێت و قاپە شیرینی لادەبرێت، جەمشیدیش بەردەوام قسەدەکات و باسی ژیانی خۆی دەکات، بێئەوەی ڕاستەوخۆ باس لەوە بکات کە دەتوانێت بفرێت. سافیناز کە هەم بەسفرە و هەم بە قسەکانی جەمشید خان و هەم بە ناوی تایەفە و خێڵی ئێمە سەرسامە، لەگەڵ مامم‌دا دەیکاتە سوحبەت و پێکەنین، بە قسە دانیشتنەکە درێژدەکاتەوە، بە قاقا جەمشیدخان دەخرۆشێنێت و گەرمیدەکات، هەر کە تامی خواردنێکیش دەکات دەکەوێتە وەسفێکی زۆری سفرەکە، بە جۆرێک ناڕاستەخۆ ببێتە وەسفی زەوقی بڵند و میوانداری میرانەی جەمشید خان. لە ئێوارەدا کە سافیناز دەبێت هەستێت و بڕوات، جەمشید لە کردەیەکی چاوەڕوان نەکراو و ڕاستەوخۆی عاشقانەدا دەستی سافیناز دەگرێت و تکای لێدەکات لەم هەفتەیەدا هەر شەوێک با بوو، سەعات یەکی شەو کە خەڵک هەموو دەخەون بچێتە سەربان و چاوەڕوانبکات، چونکە شتێک دەبینێت و دەبیستێت کە پێشتر نەیبینیوە، بەڵام نابێت لێی تێک بچێت، هەر شەوێک کە با بوو... هەر شەوێک کە با بوو.

هەر ئەو ڕۆژە مامە جەمشیدم ناردییەوە بەدوای من و سمایلدا و گووتی دەبێت خۆمان ئامادەبکەین و پەت بکڕین، چونکە نیازێتی دووبارە لەم شەوانەدا بفڕێت. من و سمایل کە گوێمان لەو هەواڵە سەیرەبوو، سەیری یەکترمان کرد و بە دوودڵییەکی زۆرەوە ملمان بۆ داخوازییەکەی دا. دەبێت بڵێم جەمشید خان لەو کەسانەبوو کە شەرمی نەدەکرد لە کاتی پێویستی خۆیدا بنێرێت بەدوامانداو کارمان پێڕاسپێرێت، گەر کاریشی نەبایە فەرامۆشمانبکات و نادیدە بمانگرێت.

بۆ ڕۆژی دوایی من و سمایل بە هەمان جۆش و خرۆشی جارانەوە بۆ خزمەتی جەمشید، چووین بۆ بازاڕ و هەر چەشنە پەتێک لای فرۆشیاران دەستدەکەوت کریمان و شەو درەنگ لە حەوشە گەورەکەی ماڵی باپیرە حیسامدا دەستمانکردەوە بە تاقیکردنەوە. ئەوکات زیاد لە سێ ساڵ بوو جەمشید نەفڕیبوو. من وامدەزانی سەرەتا بۆی سەخت دەبێت و ماوەیەکی دەوێت تا دەتوانێت بێترس لە هەوادا بەربێت، بەڵام ئەو بەبۆچوونی من پێکەنی و گووتی «خۆشەویستی دەتوانێت هەموو پیاوێک بکاتە باڵدار و بیفڕێنێت». ئەو شەوە گەرچی با زۆر بەهێز نەبوو، بەڵام کێشی خان بە چەشنێک سووک بوو، من هەستم بە سەنگی ئەو نەدەکرد، وەها ئاسان لەزەوی هەستا من وای بۆچووم ئەوەی ئێمە هەڵمانگرتووە تەنیا قورسایی ڕۆحێتی. دوای هەندێک لەنگەرگرتن و ئاڕاستەکردن، خان دابەزی و ئێمەی دانا و چیرۆکی سافینازی لە نوکەوە بۆ گێڕاینەوە و گووتی هەر کاتێک هەوا جوڵا و با هەڵیکرد دەبێت بە جۆرێک هەڵمدەن لە بەرزاییەکی گونجاودا بگەمە سەر سەربانی ماڵی سدیق پاشا تا لە ئاسمانەوە خۆشەویستی خۆم بۆ سافیناز بەیانبکەم.

بۆ ڕۆژی دوایی من و سمایل گەشتێکی ئەندازەیی گەورەمان بە دەوری ماڵی سدیق پاشادا کرد تا گونجاوترین شوێن بدۆزینەوە و باشترین جێگا دیاریبکەین کە بشێت لە هەڵداندا جەمشید خان هەم نە زۆر بەرزبێت دەنگی بە سافیناز نەگات و هەم نە زۆر نزم بێت خۆی بدات لە تەلی کارەبا و ستارەی ماڵان و ئارێلی تەلەفزیۆنەکان. دیارە ئەزموونی درێژمان لە سوپا سوودێکی گەورەی پێگەیاندین و. دواجار سەربانی باغچەیەکی ساوایانمان دۆزییەوە کە لە پێشەوە تەنیا دوو سەد مەترێک لە ماڵی سافینازەوە دووربوو، ئیدی ئەو جێگایەمان کردە شوێنی فڕین و نیشتنەوەی جەمشید خان.

دوای دوو ڕۆژ لەوە نیوەڕۆیەک بایەکی بەهێز هەڵیکرد. جەمشید خان هەر چاوی بە با کەوت و بینی چۆن داران بەیەکدا دەدات و جل لە تەنافان دەفڕێنێت و تەنورە هەڵدەداتەوە و جامانە دەخاتە خوارێ، دڵخۆشییەکی گەورە گرتی و ڕەفتاری لەگەڵ ئێمەدا گۆڕدرا. ئێمە دوو ڕۆژبوو لەسەر خواستی ئەو لە سالۆنەکەی ماڵی باپیرەدا پاڵماندابووەوە و چاوەڕوانی بامان دەکرد هەڵبکات، ئەو ڕۆژە کە بارەشێکی بەهێز هات، جەمشید زوو زوو لە پەنجەرەوە سەیریدەکرد و دەیگووت دەبێت بۆ کاری ئەمشەو ئامادەبین. ئەو سەرەتا دەیویست لە کاتی فڕیندا قاتێک جلی بێجی لەبەربکات و بۆینباخ ببەستێت و پێڵاوی سپی لە پێبکات. من و سمایل ئەوجارە بێدوودڵی بۆمان ڕوونکردەوە کە جگە لە ڕەش هەر ڕەنگێکی تر بپۆشێت، ئەگەری ئاشکرابوون و بینینی لەلایەن خەڵکییەوە زۆرترە و دەشێت شتێکیش بێتە پێشێ، جارێکی دی نەتوانێت بەسەر ماڵی سدیق پاشادا بفڕێتەوە. گەر ئەو ئەگەرە نەبایە جەمشید لەوانە نەبوو ئاسان گوێ لە ئێمە بگرێت. کە شەو داهات جەمشید یەک بە یەک

چرکەکانی دەژمارد، کە کاتژمێر گەیشتە دوازدە ئێمە بەخۆمان و پەتەکانمانەوە سوار ماشێنەکە بووین و لە ماوەیەکی کورتدا گەیشتینە بەردەم باغی ساوایانەکە. لە خۆشبەختی ئێمەدا شەوێکی تاریک بوو، وەک هەمیشە تەواوی کارەبای شار بڕابوو، کە ئێمە چووینە ناوەوە جگە لە دەنگی با دەنگێکی دی نەبوو. من یەکەم کەس بە کۆمەکی پەیژەیەکی بچوک گەیشتمە سەربانی جێگاکە و بە پەت جەمشید خانم ڕاکێشایە سەرێ و دوای منیش سمایل سەرکەوت، دواتر من گەڕامەوە و هەموو پەتەکانم داگرت و بەپێی ئەو نەخشەیەی پێمانبوو جەمشید خانمان بە ئاسماندا هەڵدا و وەها لەنگەرمان بۆ دیاریکرد لە سەعات یەکی تەواودا بە بەرزاییەکی گونجاو لەسەر ماڵی سدیق پاشا بوو. جەمشید لەو باوەڕەدا نەبوو توانای ئێمە بۆ ئاڕاستەکردن و لەنگەرگیری هێشتا وەک سەردەمی سوپا هەر بەهێزبێت، بەڵام ئەو شەوە بۆی دەرکەوت کە ئێمە ئەو هونەرانە چۆتە خوێنمان و لە مێردمنداڵییەوە لەگەڵماندایە و بۆمان لە بیرناکرێت. سافینازیش لە سەعات یەکدا دەچێتە سەربان و لە سەر بەرزترین ستارەی ماڵی خۆیان دەوەستێت، جەمشید خان لەسەرەوەڕا دەیبینێت کە بە پلەکاندا سەردەکەوێت و سەیری ناو تاریکی سەربانەکە دەکات. ئەوەی کیژەکە حیسابی بۆ نەکردوە ئەوەیە جەمشید خان لە ئاسمانەوە قسەی لەگەڵدا بکات. جەمشید کە فێڵزان و خاوەن مەکربوو، ماوەیەک هەر لەسەرەوەڕا سەیری سافیناز دەکات، بێئەوەی هیچ بڵێت... کە هێدی هێدی خەریکە گوژمی ڕەشەباکە خانم وەڕزدەکات و وادەکات بەرەو خوار دابەزێت، لە ساتێکدا خەریکە بجوڵێت و بچێتەوە سەر پلەکان هاواری لێدەکات و دەڵێت «چییە سافیناز خان پێدەچێت ڕەشەبا تۆی بێزار کردبێت و بتەوێت زوو بڕۆیتە خوارێ». سافیناز سەرەتا دەتۆقێت و نازانێت دەنگەکە لە

کوێوە دێت، پاش تۆزێک هەستدەکات سەرچاوەی دەنگەکە ئاسمانە و بەترسەوە سەربەرزدەکاتەوە و دەبینێت تارماییەکی ڕەش بەسەر سەرییەوە دەفرێت، وەختەبێت بقیژێنێت. جەمشید خان پێیدەڵێت «نا سافیناز هاوار مەکە، من جەمشید خانم ... بێکێشترین پیاوی دونیام، کەسێکم هەوا دەتوانێت وەک دەزوویەک بمهێنێت و بمبات، دەمەوێت لەمسەرەوە خۆشەویستی خۆمت پێبڵێم، بۆ ئەوەی تۆ یەکەم ژنی سەر زەمین بیت کە پیاوێک لە ئاسمانەوە خۆشەویستی خۆی بۆ بەیاندەکات و لێرەوە لەم بەرزاییەوە، لەم تاریکییەوە، لە ناو ئەم ڕەشەبایەدا داوات لێدەکەم شووم پێبکەیت و وەک هاوسەر قەبووڵمبکەیت». سافیناز خان کە هەم تۆقیوە و هەم پێکەنینیشی بەم پیاوە تەنک و باریکەی ناو هەوا دێت کە بە هۆی جلە ڕەشەکانییەوە بە ئەستەم لە زوڵمەتی شەودا دەبینرێت، داوا لە خان دەکات لە ئاسمان دابەزێت و پێکەوە قسەبکەن، بەڵام ئەو لە ناو تاریکییەوە دەڵێت «خۆشەویستترین کەسی جەمشید خان، وەک دەبینیت ئەمشەو با زۆر بەهێزە و من بە دوو پەت بە زەوییەوە بەستراوم، دابەزینم پێویستی بە تەدبیر و بیرکردنەوە هەیە، گەر وانەبێت دەشێت با لەگەڵ خۆیدا بمبات و هەرگیز نەمبینیتەوە».

ئەو شەوە من و سمایل چەند سەعاتێک لەبەر بادا ماینەوە، بەر لەوەی تاریکی بڕەوێتەوە و لە بانگی بەیانی نزیکببینەوە، جەمشید ئاماژەی داینێ و ئێمە کێشامانەوە.

لەو شەوەوە بۆ ماوەی سێ مانگ و تا گەیشتینە ڕۆژی زەماوەندی جەمشید، لە هەموو شەوێکی بادا من و سمایل، ئەومان بەرەو ئاسمان بەرزدەکردەوە و بە پەتێکی سێهەم و تایبەت کە خۆی لە هەواوە بۆ خوارێ ڕاهێڵیدەکرد، سافیناز ڕایدەکێشا و لە هەورەبانەکەی ماڵی سدیق پاشادا پێکەوە

دادەنیشتن و باسی خۆشەویستی و ژیان و پاشەڕۆژیان دەکرد. هەمیشەش من و سمایل لە سەربانی باغچەی ساوایانەکەدا بەسەبرەوە لە بەر سەرما وەنەوزمان دەدا و ئازاری چاوەڕوانییەکی درێژمان دەکێشا، کە لە ڕاستیدا چاوەڕوانی ژیانێک بوو کە ئێمە تیا نەدەژیاین و جەمشید خان تیا دەژیا.

دڵدارییەکەی جەمشید خان زۆر قورس لەسەر هەموومان تەواوبوو، زیانەکانی ئەم خۆشەویستییە هەر ئەوە نەبوو کە من و سمایل بەردەوام هەڵامەتمان هەبوو و بەدرێژایی ئەو وەرزە دەپژمین و دەکۆکین و فلوئاوتمان دەخوارد، بەڵکو بەرەو ئەوە گەشەیکرد کە جەمشید خان، حیسام خان بخاتە سەر کەڵکەڵەی دابەشکردنێکی پێشوەختی میرات تا خانی بچوک بتوانێت ئاسان ژیانێکی ئەفسانەیی بۆ سافیناز دابینبکات. سەفەرە ئاسمانییەکانی شەو، جەمشیدیان گۆڕیبووی بۆ پیاوێکی دەستبڵاو کە لە هەموو فڕینێکدا گیرفانەکانی پڕدەکرد لە گوارە و ئەنگوستیلە، بازنگ لە کاری زەڕەنگەرانی هیندوستان، لیرەی ئەسڵ کە لە زێڕی کۆنی سەردەمی عوسمانی بوون. لەو سێ مانگەدا سافیناز بە ئەندازەی دە بووکی دیکە تەنیا دیاری شەوانەی بۆهات کە کەرەمی بێسنووری جەمشید خان لە ئاسمانەوە بەسەریدا دەباراند. ئاشکرا خانمەکە هەموو چەکە ژنانەکانی خۆی بەجۆرێک بەکاردەهێنا زۆرترین سامان و گرانترین دیاری لە جەمشید خان بکێشێتەوە. من کە بینینی ئەو حاڵە پەرێشانیکردبووم، دووجار چوومە خزمەتی باپیرەم و پێم ڕاگەیاند ئەم خۆشەویستییە ژیانی جەمشید خان وێراندەکات و هەرچییەکی لە دابەشکردنی میرات وەرگرتووە، لە ماوەیەکی کەمدا لە دەستیدەچێت و ماڵوێران لە هەموو ئەم یارییە دێتەدەرێ. بەڵام باپیرە حیسام گووتی کە جەمشید کوڕێکی

تایبەتی و بەدبەختە و لەم شتانەدا هیچی لەگەڵدا ناکرێت و کەس ناتوانێت لە خواستەکانی خۆی بیگێڕێتەوە. باپیرەم لەوەدا لەسەر هەق بوو، جەمشید چی بویستبایە ئەوەی دەکرد. ئیتر سامان وماڵی خۆی بێمانا لەبەرپێی خانمدا تەخشان و پەخشان کرد. ئەو چەند هەفتەیەش کە کەوتنە پێش خوازبێنی و زەماوەندەوە جەمشید چەند جارێک داوەتی گرانبەهای بۆ سافیناز و خوشکەکانی و پورەکانی و هەتا هاوڕێ دوورەکانیشی دەکرد، هەر لەسەر داوای خانمیش قوتابخانەی زمانەکەی داخست و هەموو ئەو کچ و ژنانەی لەدەوری بوون تەراندنی، نەبا دڵی ئەوی لێزویر بێت.

جەمشید لە دابەشکردنی موڵکدا، چوار خانووی باپیرە حیسام و دوو پارچە زەوی و بڕە پارەیەکی زۆری بەرکەوت، کە لە ڕاستیدا لەو موڵکانە زۆرتربوون کە بەر سەرفرازخانی بابم کەوتن. هەر لەسەرەتاوە بۆئەوەی بتوانێت بەردەوام دیاری گرانبەها بۆ سافیناز بکڕێت و داوەتە ئەفسانەییەکانی بسازێنێت یەکێک لە خانووە گەورەکانی فرۆشت. ئەوە بوو بەو پارە زۆرەی لەو خانووە دەستیکەوت کەوتە خەرجکردنی خێرا و دروستکردنی بۆنەی گەورە گەورە. لەسەر هەمان ڕیتم و ئاواز شەکراوخواردنەوەکەی جەمشید و سافیناز ئەفسانەیی بوو، هەزاران خەڵک بانگکران، شەقام و کۆڵان و سەربانی ماڵەکانی دەوروبەریش بە سەدەها کورسی و مێز ڕازێنرانەوە... سێ ڕۆژ تەواوی پاقلاوەخانەکان کاریان بۆ مامم کرد، ڕۆژێک تەواوی میوەی بازاڕمان بۆ ئاهەنگەکە قۆرغکرد و دەیان چایچیمان بەکرێگرت و ژمارەیەکی نادیاریش ئاوگێڕ و چاگێڕمان دانا تا لە هەموو لایەکەوە خزمەتی میوانەکان بکەن. بەشی هەرە زۆری کاروباری ڕێکخستن کەوتەوە سەر ملی من و سمایل، کە دەبایە

هەفتەیەک بێپشوو بە ڕۆژ و شەو خەریکی ڕێکخستنی پێداویستییەکان و ئامادەکردنیان بین. جەمشید خان لەو دەمەدا بە ڕۆژ دەخەوت و ئێواران دووشێکی ساردی دەکرد و چاکەت و پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی کاڵی لەبەردەکرد و ڕیش و سمێڵی دەتاشی و بە نیگای یەکێکەوە قەدەر خۆشبەختی بۆ نوسیبێت، لەگەڵ خەزاڵی ماممدا لە ماشینەکەدا توند خۆی دەبەستەوە و تا شەو درەنگ پیاسەیدەکرد... ئەو ماوەیە جەمشید خان بەڕاستی خۆش دەژیا.

دەبێت بڵێم وەختێک کە داواکاران چووبوون بۆ خوازبێنی سافیناز، تا شوو بە جەمشید خان بکات، ئەو داوای پتر لە سێ کیلۆ ئاڵتونی کرد. مامم بێئەوەی بیربکاتەوە، تەواوی ئەو پارە کاشەی لە میرات وەریگرتبوو دای بە زێڕ و جیازی و مۆبیلی ماڵ، یەکێک لە هەرە خانووە خۆشەکانی باپیرەمی ڕازاندەوە و بۆ ژیانی داهاتوو ئامادەیکرد. جەمشید لە ڕازاندنەوەی ماڵەکەدا زەوقێکی جوانی بەکارخست و ناردی لە زۆر جێگای دوورەوە دیکۆر و توحەفیاتی بۆ هات، شتێک کە سەرەنجی منی ڕاکێشا ژمارەیەک لە تابلۆی عاشقە فرپیوەکانی شاگال بوو کە جەمشید خان بە ئەندازەیەکی تایبەت لە هەموو جێگایەکی ماڵەکەدا هەڵیواسی بوون. سمایل سەیری لێهات کە ئاخۆ جەمشید خان ئەمجۆرە تابلۆ قەشەنگانەی لە کوێ دیبێت و چۆن ڕێگای کەوتبێتە سەر شاگال. دواتر زانیمان، یەکێک لە قوتابییە کچەکانی کە چیرۆکی عەشقە باڵدارەکەی مامی بیستبوو، کتێبێکی تایبەت بە تابلۆکانی شاگالی پێشکەش بە خانی عاشق کردبوو. لە ڕاستیدا خانمی سافیناز لەو ژنانە نەبوو کە لە شاگال و مانای عاشقە فرپیوەکانی ئەو تێبگات، بە پێچەوانەوە ئەو لەسەر تەرزی ئەو نەغمە زێڕپەرستەی زۆر لە کچانی شاری

لەسەر گۆشبووبوون، خەیاڵیدەکرد و دونیای دەبینی. مەکری سافیناز بەوەوە نەوەستا کە زۆرترین دیاری و زێڕ لە جەمشید خان بستێنێت، بەڵکو جەمشید بۆئەوەی خۆشەویستی و وەفای خۆی پتر پیشانبدات خانووی دووەمیشی لەسەر خانم نوسی. شتەکە وەهابوو کە سافیناز لەبەردەم جەمشیدا دەستیکردبووە گریان و گووتبووی تۆ پیاوێکی دەشێت ڕۆژێک با بتفرێنێت و لە کیس من بچیت، چۆن لە پاشەڕۆژی خۆم دڵنیابم، چۆن بزانم ئەم شووە نابێتە مایەی بەدبەختی بۆم، تۆ گەر موڵکێکی ڕاستەقینە بە ناومەوە نەنوسیت، گەر ڕۆژێک با تۆی برد، براکانت بە کراسی بەری خۆمەوە دەمکەنە دەرێ و نابم بە خاوەنی شتێک کە پاشەڕۆژم زامنبکات.

قسەکانی سافیناز بۆ جەمشید وەها کاریگەر بوون، هەر هەمان ڕۆژ بڕیاری دا یەکێک لە دوو خانوەکەی خۆی بخاتە سەر سافیناز.

دوای زەماوەند کە جەمشید خان و سافیناز لە مانگی هەنگوینی گەڕانەوە، بەیانییەک من و سمایل چووین بۆ بەخێرهاتنەوەیان، جەمشید خان و خانممان بینی لە سەر مێزێکی گەورە لە حەوشەکەدا و لە بەر هەتاوی بەیانی بەرچاییان دەخوارد... هەر ئەو بەیانییە بینیمان جەمشید خان پەتێک لە کەمەریایەتی و سەری دووەمی پەتەکە بە دارێکەوە لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا بەستراوەتەوە ... ئێمە هەرگیز جەمشید خانمان بە هیچ شتێکەوە نەدەبەستەوە، چونکە خۆی دەیگووت من سەگ نیم بە درەخت و عەمود و شتەکانی دییەوە بمبەستنەوە. بەڵام دواتر بۆمان دەرکەوت کە سافیناز زۆرجار ماممی بەو شتانەوە بەستۆتەوە و بەسەعات بەجێیهێشتووە، بێئەوەی جەمشید جارێکیش چییە دەنگ بەرزبکاتەوە. هەر لەو بەیانییەدا کە ئێمە

دەرکەوتین، پاش تۆزێک سافیناز ڕووی لە ئێمە گرژکرد و بە توندی دەریکردین و گووتی خۆی لەمەولا هەموو کاروبارێکی خان دەبات بەڕێوە و ئیتر پێویستیان بە ئێمە نییە. سەرەتا ڕاموابوو کە خان ئەمە قەبووڵ ناکات، بەڵام جەمشید لە ڕۆبێکی ئاوریشمی سووردا بێباک درێژەی بە بەرچاییەکەی خۆیدا و جگە لە خەندەیەکی کاڵفامانە هیچی دی پیشان نەداین، کە نەک خەندەی شەرم، بەڵکو خەندەی گەمژەیی بوو... من ئەو بەیانییە تێگەیشتم کە مامم تازە تیاچووە.

ئەو ماوەیەی کە جەمشید لە کۆشکەکەی خۆیدا و لە ناو تابلۆی عاشقە فریوەکانی شاگاڵدا لەگەڵ سافینازدا دەژیا هەواڵی لە هەموومان بڕا، هەتا باپیرە حیسامیش بە هۆی ڕەفتاری نابەجێی ژنەکەیەوە هاتوچۆی نەدەکردن. ئیدی سافیناز خۆی هەموو شتێکی لە ژیانی ئەودا دیاریدەکرد، جەمشید خان تەنیا ئەو کاتانەش دەفڕی کە سافیناز داوای لێدەکرد و ئەو ماوەیەش لە ئاسماندا دەمایەوە کە ئەو بۆی دیاریدەکرد. سافیناز کاری گەیاندە ئەوەی خەزاڵی هاوڕێشی دەرکرد و ئیدی خۆی ئەو ماشێنەی لێدەخوڕی کە جەمشید وەک هەمیشە لە پێشەوە دادەنیشت و وەک گەمژەیەک تەماشای دونیای دەکرد. پاش هەشت مانگ لە شووکردن ڕۆژێک سافیناز کوڕێکی گەنج دەهێنێت و دەڵێت لە ئێستا بەدواوە ئەم کوڕە لەنگەر بۆ تۆ دەگرێت و ئەو تۆ دەباتە ئاسمان و داتدەگرێت. تا ئەوکات جەمشید هەر کاتێک بفڕیبایە سافیناز و خوشکەکانی و سدیق پاشای باوکیان پەتەکەیان بۆ دەگرت، خۆشی و کامەرانییەکی منداڵانەشیان لەوەدا دەبینی زاوایەکی وەها باڵداریان هەیە کە وەک کۆلارە دەتوانن هەڵیبدەن. خوشکەکانی بە سافینازیان دەگووت کە تۆ خۆشبەختترین ژنی دونیایت، چونکە هیچ ژنێک

نییە لە دڵەوە نەخوازێت مێردێکی وەهای هەبێت، بتوانێت جار جار وەک کۆلارە هەڵیبدات. من کە چیرۆکی ئەو کوڕەم بیست و ناوەکەیم دۆزییەوە، دوای پشکنینێکی ورد بۆم دەرکەوت ئەو گەنجە کەس نییە لە « ئیحسان بایەزید» زیاتر کە چەندین ساڵە لە ژێرەوە دۆستی سافینازە و بەڵام لە بەر دەستکورتی ناتوانێت بێتەپێشێ و داوای خانم بکات. بێهیچ دوودڵییەک و بێئەوەی گوێبدەمە عاقیبەتی شتەکان بەیانییەک چووم بۆ ماڵی جەمشید خان و هەموو شتێکم پێگووت و گووتم، ئەو کوڕەی کە شەوان لەنگەرت بۆ دەگرێت، دۆستێکی دێرینی خانمە و ئەو بێئەوەی بە خۆی بزانێت بۆتە قوربانی پیلانێکی گەورە و هەقە بە هۆش خۆیدا بێتەوە و لەوە زیاتر ڕۆڵی مێردێکی هەڵخەڵەتاو قەبووڵ نەکات. جەمشید خان بە جۆرێکی چاوەڕوان نەکراو لێمتوڕەبوو و لە ماڵی خۆی دەریکردم و گووتی، من هیچ نیم جگە لە درۆزنێک کە دەمەوێت بەختەوەری و خۆشبەختی پیاوێکی نەخۆش و بەدبەخت تێکبشکێنم، چونکە ژیانێکی ئاسوودەی دۆزیوەتەوە و خۆشەویستییەکی گەورە دەژی. گووتی من هەر لەسەرەتاوە نیازم بەدبەختکردنی ئەوە و هەموو هەوڵێک دەدەم و لە هیچ دەست ناگێڕمەوە گەر بزانم بەدبەختی جەمشیدی تێدایە، پلانم هەیە کە بیکوژم و گەر وابڕوات هیچ چارێکی نییە جگە لەوەی لای پۆلیس شکاتم لێبکات. من دەمزانی مامم ئەوجۆرە قۆناغانەی کوێری و هیچنەبینی تووشدێت، ئەوەش بەشێکە لە دەرەنجامەکانی ئەو دۆخە فیزیکییەی وادەکات جەمشید دونیا لە گۆشەیەکی دوورەوە ببینێت و لە زۆر شتی سەر زەوی تێنەگات. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵەکانی من بۆ ڕزگارکردنی جەمشید خان بەردەوامبوون و هەر یەک لە باوکم و ئەدیب خانیشم خستە سەر ئەو بڕوایەی کە جەمشید هەر بەڕاستی لە مەترسیدایە، بەڵام هەوڵی هەریەک لە

سەرفراز خان و ئەدیب خانیش بێئەنجام مایەوە. دوای حەوت مانگ لەو ڕۆژەی کە جەمشید منی بە هاوار هاوار لە ماڵی خۆی دەرکرد، دوای ئەوەی ماوەیەک وازم لەوە هێنا غەمی بخۆم... وەک چاوەڕوان بووم، بەیانییەکی تۆفان و سەرما سافیناز خان بەگریان خۆی کرد بە ماڵی باپیرەمدا و گووتی کە جەمشید خان شەو با هەڵیگرتووە و هیچ کەس نازانێت بەرەو کوێ فڕاندوێتی.

.ئەو چیرۆکەی خانمی سافیناز گێڕایەوە وابوو کە جەمشید لەو شەوە تووش و باراناوییەدا خواستی هەبووە بفڕێت، هەرچەند ئەو و ئیحسان بایەزید ویستوویانە ڕێگری لێبکەن و پێیانگووتووە کە تۆف و سەرمایە، بەڵام ئەو گوێی بە تکا و هاواری ئەوان نەداوە و لەسەر فرین سووربووە، کاتێکیش گەیشتۆتە کەشکەشانی فەلەک پەتەکەی پچڕاوە و لە هەوادا بەربووە و با بردوێتی. هەمان ئەو چیرۆکە بوو کە من چاوەڕوان بووم سافیناز دروستیبکات و دروستیشیکرد. لە شەوێکی باراناوی و گەردەلوولدا سافیناز جەمشید خانی ناچارکردبوو بفرێت و خۆی و عەشیقەکەی لە خوارەوە تا توانیبوویان بەرەو باڵا هەڵیاندابوو، بۆ جێگایەک کە با بتوانێت زۆر زۆر دوور هەڵیبگرێت و نەگەڕێتەوە. دوای ئەو شەوە جەمشید خان تا ساڵێک زیاتر هەواڵی بڕا، گەڕان و سۆراغە بەردەوامەکانی ئێمە لە شار و شارۆچکە و گوندەکانی دەوروبەردا سوودی نەبوو. ئەمجارە هەموو دڵنیابوون کە جەمشید خان مردوە، بەڵام من هەستمدەکرد و دەمزانی کە جەمشید لە جێگایەکدا کەوتۆتە خوارێ و ئێستا لە شوێنێکدا دەژی کە لێرەوە دوورە و گەڕانەوەی ئاسان نییە.

لەو ساڵەدا بەو وەکالەتەی پێشتر سافیناز بە مامی مۆرکردبوو، خانوویەکی بچوک نەبێت کە باپیرم مەرجی لەسەر دانابوو،

زۆربەی موڵکەکانی مامی فرۆشت و لەگەڵ ئیحسان بابەزیددا بەپارەیەکی زۆرەوە بەرەو دەرەوەی وڵات هەڵهاتن. ئێستا خۆی و مێردەکەی چەندین ساڵە لە خۆرئاوای کەنەدا دەژین و سێ منداڵیان هەیە و نە باڵدار و نەبێ باڵ دەستی پیایاندا ناگات.

لەو ماوەیەدا حیسام خان و مامم چەند جارێک کەوتنە سەر ئەو خولیایەی پرسە بۆ جەمشید دابنێن، بەڵام من هەمووجارێک دەموەستاندن و دەمگووت جەمشید زیندووە و هێندە نابات نیشانە و هەواڵێکمان لەوەوە پێدەگات. دوای زیاتر لە ساڵێک، ڕۆژێک کیژێکی لاواز و ڕەنگ پەڕیو هات بۆ ماڵی ئێمە و تکای لە من کرد لەگەڵیدا بڕۆم، چونکە ڕاسپاردەیەک هەیە دەبێت وەریبگرم... لە نیوەڕۆیەکی گەرمی هاویندا دوای سەفەرێکی درێژ بە تاکسییەکی کۆن گەیشتینە بەر ماڵێکی داڕوخاو لە ناحییەیەکی دەرەوەی شار، لەوێ و لای خێزانێکی هەژار و لە ناو پێخەفێکی شڕدا، جەمشید خانم لەسەرەمەرگدا بینییەوە... پیاوێکی لاواز کە جگە لە هاوار بۆ خودا هیچی دیکەی نەدەگووت.

## جەمشید خان و خودا

بەشی زۆری ڕووداوەکانی ئەو ساڵەی کە تێیدا جەمشید بێسەروشوێن بوو بە نهێنی مانەوە، دواتریش چەند هەوڵمدا چیرۆکە ڕاستەقینەکەی بزانم، هەوڵەکانم نەگەیشتنە جێگایەک و هیچم تەواو بۆ ساغ نەکرایەوە. ئەو زانیاریانەی من کۆمکردنەوە ئاماژە بەوە دەدەن، ئەو شەوەی جەمشید تیا وندەبێت و با

لەگەڵ خۆیدا دەیبات، گوژمی بەهێزی ژیان ڕووەو باکوور هەڵیدەگرێت و لە چیا دوورەکان، لە نزیک بنکەیەکی گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان «پەکەکە» وە دەیدات بەزەویدا. دەمەوبەیانێکی سارد و تەڕ دوو کیژە گەریلا نیوەمردوو دەیدۆزنەوە، پیاوێکی بێکێش کە هەتا ناوی خۆشی لەبیرنەماوە و تەنیا شتێک لە یادێتی ئەوەیە کە دەتوانێت بفڕێت و دەشزانێت ناوەکەی بە وشەی خان کۆتاییدێت. چونکە ناوی تەواوی خۆی نازانێت گەریلاکان بە مەزلوم خان ناویدەنێن و لای خۆیان گلیدەدەنەوە. گەریلاکان بە هیوای ئەوەی یادەوەری بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، ماوەیەکی درێژ دەرمانیدەکەن و دەیخەنە بەر خزمەتێکی تایبەتی، بەڵام هەوڵەکانیان بێسوود دەبێت. کاتێک دەبینن مەزلوم هەر بەڕاستی دەتوانێت بفڕێت لە جەنگە خوێناوییەکانی خۆیاندا لەگەڵ سوپای تورک و جاشە کوردەکاندا بەکاریدەهێنن. ئیدی خانی مامم وای لێدێت وەک وەڵاتپەروەرێکی ڕاستەقینە ناوی دەڕوات و هەر وەک کوردێکی توندڕەویش بیردەکاتەوە، هەتا دەڵێن دووجۆر ئاوازی نوێی بۆ سروودی ئەی ڕەقیب داناوە کە ئەودەم هێدی هێدی خەریکبوو دەبووە سروودی نەتەوایەتی ئێمە و لە هەر چوارپارچەکەدا دەگووترایەوە. جەمشید پتر لە ساڵێک لەگەڵ گەریلاکاندا دەمێنێتەوە، بەسەریاندا دەفڕێت، پاسەوانیی بنکە نهێنییەکانیان دەکات، چاوەدێری ئەو ڕێگا دوورانە دەکات کە دەشێت دوژمنیان لێوەبێت، شوێنی بۆسەی سەربازە تورکەکان دەستنیشاندەکات و ڕێگای هاتوچۆی ئەوان دەدۆزێتەوە، تا ساڵێک زیاتر وەک پێشمەرگەیەکی چالاک کۆمەک بە جەنگاوەرەکانی باکوور دەکات و بنکەکانیان لەزۆر بەڵای گەورە دەپارێزێت. بەڵام لەڕۆژێکی هاویندا شەماڵ خیانەتی لێدەکات و کاتێک جەمشید لە ناوەڕاستی ئاسماندایە، با دەوەستێت و هەوا سروەی نایەت و

هێزی ئەوەشی نامێنێت پووشێک لە شوێنی خۆی هەڵبگرێت، لەو ڕۆژەدا خان لە کەشکەشانی فەلەکەوە بەردەبێتەوە و لەو قەڵادۆشکانی گەردونەوە دەکەوێتە خوارەوە... ئەو کەوتنە خوارەوەیەی هەموو کاراکتەری پێشینی جەمشید دەسڕێتەوە و شتێکی دی تیا سەوزدەکات کە تا ئەوکاتە بەو نامۆ و نەناسراوبووە.

دوای کەوتنە خوارەوەی جەمشید، گەریلاکان کە بەڕاستی جەمشیدیان خۆشدەویست، دەیگوێزنەوە بۆ خەستەخانەیەکی بچوکی ناو ئەشکەوتەکان، لەوێدا کیژێک لەو کیژانەی لە قوتابخانە عەرەبییەکەی جەمشیددا وانەی خوێندوە و دواتر بووە بە گەریلا، دەیناسێتەوە و دەزانێت ئەم مەزڵوم خانە لە جەمشید خانی مامۆستای عەرەبی بەولاوە کەسی تر نییە کە یادەوەری خۆی لەدەستداوە. بەڵام هەموو لەوە سەرسامن کە مامم دوای بەربوونەوەی جگە لە ناوی خودا هیچی دیکە ناڵێتەوە، تەنیا شتێک دەیکات سەر بۆ ئاسمان بەرزدەکاتەوە و پەنجە بۆ سەرەوە بڵنددەکات و وەک لاڵێک شتێکی مەترسیدار نیشانی خەڵک بدات ، دەڵێت «خودا ... خودا ... خودا».

دوای ئەوەی گەریلاکان هەرچییەکیان بۆ دەرمانکردنی خان لە تواناادا بێت دەیکەن، ڕۆژێکیان ئەو کیژە ڕادەسپێرن ئەم پیاوە نەخۆشە کە چیتر مانەوەی لەو کێوانە سوودی بۆ کوردستان نییە، بگێڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی لە باشوور. ئیدی لەسەر کەرێکی پیر دەیبەستنەوە و بەڕێگایەکی شاخاوی دووورودرێژدا دەینێرنەوە بۆ دەڤەری خۆمان و لە ماڵی چالاکەوانێکی خۆیان دایدەنێن. کە من گەیشتمە سەر جەمشید ئەو لەو ماڵەدا و لە ناو ئەو پێخەفە شڕەدا بوو. من زۆر سوپاسی ئەو کیژە گەریلایەم کرد کە لە باکوورەوەڕا و بە ناو ئەو هەموو مەترسییەدا مامی هێنابوو.

دوای تێپەڕینی پتر لە دوو ساڵ جارێکی تر بەدەستی خۆم جەمشیدم هەڵگرت و خستمە ناو ماشێنێک و هێنامەوە بۆ ژوورەکەی خۆی لە قاتی سەرەوەی کۆشکە دێرینەکەی حیسام خان.

جەمشید تەنیا دوای هەفتەیەک منی ناسییەوە، من لێم پرسی «مامەگیان، من کێم... چۆن من ناناسیتەوە ؟»، ئەو گووتی «تۆ سالار خانی کوڕی سەرفراز خانی کوڕی حیسام خانی». ئەو وەڵامە بە پلەیەک دڵی خۆشکردم هەمووماڵی باپیرەمم لە خۆشیدا لەدەوری پێخەفەکەی جەمشید کۆکردەوە، بەڵام جەمشید ئەو ڕۆژە لە من زیاتر کەسی دیکەی نەناسییەوە، هەتا حیسام خان چەند هەوڵیدا بەڵام مامم بە عینادییەکی گەورەوە دەیگووت «کەڵتەکۆن تۆ کێیت؟ من لە ژیانمدا تۆم نەدیوە». مانگێک زیاتری ویست تا خان کەوتەوە سەر دۆخی سروشتی خۆی و هەموومانی ناسییەوە، بەڵام جگە لە کەڵکەڵەی خودا هیچی دی لەسەردا نەبوو، ئەوەی لە بیربوو لەگەڵ سوپای تورکیادا شەڕیکردوە، بەڵام نەیدەزانی چۆن و لەبەرچی، لەیەک شت دڵنیابوو ئەویش ئەوەبوو لە دوا فڕینیدا خودای بینیوە.

دوای مانگ و نیوێک ئێوارەیەک من و سمایلی بانگکرد و گووتی کە دەبێت دووبارە بفڕێت، چونکە دڵنیایە جارێکی دیکە خودا دەبینێت. من مامم ئاگادارکردەوە و گووتم جەمشید خان ئیسلامییەکان ئێستا بەهێزن، ئەوان ئەمجۆرە قسانە بە کوفر حیسابدەکەن، بینینی خودا لە قودرەتی ئادەمیزادا نییە، ئیدیعای لەوجۆرە دەشێت عاقیبەتی خراپی بۆ تۆ هەبێت. جەمشید گووتی «خودا مۆڵەت لە کەس وەرناگرێت تا خۆی پیشانی عەبدەکانی خۆی بدات، کێ چوزانێت خودا چی دەکات و چی ناکات، ئەوانەی وادەڵێن دەبێت شەرم لە خۆیان بکەن».

جەمشید خان ئەمجارە سروشتێکی دەروێشناسا و زاهیدی وەرگرتبوو، هیچ شتێکی لەو پیاوە نەدەچوو کە سەردەمێک مارکسی و سەردەمێک سەرباز و دەمێکی دیش خانمباز بوو، ئێستا بە جیدییەتێکی بێوێنەوە دەیویست لە خودا تێبگات. تاکە شتێک کە لە خەیاڵیدا بوو ئەوە بوو زۆرترین پەت بکڕین، گووتی «تابەرزتر بفڕم، ئەگەری بینینی خودا زۆرترە». ڕۆژێک من و سمایل بردمانە دەرەوەی شار و دەمەوئێوارەیەکی درەنگ لە دەشتێکی چۆڵدا ناردمانەوە بۆ ئاسمان، جەمشید خان دوای چەند سەعاتێک چاوەڕوانی ئاماژەی داینێ دایگرین و گووتی کە بەداخەوە هیچ شتێکی نەبینیوە، بەڵام دڵنیایە دەیبینێت. نزیکی مانگێکی تەواو لەو دەشتەدا چادرمان هەڵدا و چاوەڕوانی ئەوەمان کرد جەمشید خان خودا ببینێت. لە کۆتایی هەفتەی چوارەمدا جەمشید بە گێژی و مەستییەکی بێوێنەوە، بە نورێکی گەورەوە لە چاویدا و بە ڕوناکییەکی گەورەوە لە دڵیدا دابەزی و گووتی «بینیم، خودام بینی، نورێکی خالیس بوو کە جگە لە نور هیچی دی لێ ناکەوێتەوە». گووتی کە خودا پێیگووتووە «من کێشی تۆم وەها سووک کردوە تا وەک موعجیزەیەک پیشانی موسڵمانانی بدەیت و ببینن خودا ئیرادەی لەسەر هەرچییەک بێت دەیکات، بڕۆ و بە ئیمانداران بڵێ کە تۆ یەزدانی گەورەت بینیوە و پێیگووتوویت بفڕە تا خەڵک بەچاوی خۆیان توانا و گەورەیی خالیق ببینن». من قسەکانی جەمشید بەیەکێک لەو نۆبەتە جیاوازانەی وڕێنە تێگەیشتم کە مامم هەندێجار لە هەوادا تووشی دەهات. دڵنیابووم بە هۆی ئەو هەموو ناخۆشی و کارەساتەی جەمشید لەسەر زەوی تیادەژی، ئێستا کە دەفڕێت سەر بۆ ئەوسەری گەردون بەرزدەکاتەوە و دەیەوێت ڕزگارکەرێک و فریادرەسێک لە ئاسماندا بدۆزێتەوە. جەمشید بەم دونیابینییە نوێیەی ئێمەی تووشی دەردەسەرییەکی گەورە دەکرد، تا

ئەوکات باوەڕی بەوە نەبوو ئاشکرا بفڕێت و خۆی وەک مەخلوقێکی باڵدار نیشانی خەڵک بدات، بەڵام ئێستا خۆی وەک موعجیزەیەکی ئیلاهی دەبینی و دەیویست لەشی خۆی و با بردنی وەکو کەرەستەیەک بۆ بەهێزکردنی ئیمان بەکاربهێنێت. ئەوە هەم لای من و هەم لای سمایلیش کارێکی نادروست بوو.

کە گەڕاینەوە بۆ شار، جەمشید هێدی هێدی ڕیشێکی درێژی هێشتەوە و بەرماڵێکی گەورەی کڕی و دەستیکرد بە نوێژکردن. گەڕانەوەی جەمشید بۆلای خودا، لە خێزانەکەماندا دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو. سەرفراز خانی باوکم و مامە ئەدیبم دوو کەسی دینی بوون، ئەم مەیلە تازەیەی جەمشید زۆر دڵیخۆشکردن و بەدەنگی بەرز کەوتنە ستایشکردنی جەمشید و باسکردنی تواناکانی بۆ پەیوەندیکردن بە ئاسمانەوە. گەرچی من لەسەرەتاوە هەموویانم لە ترسناکی قسەکانی ئەو ئاگادارکردەوە و گووتم ئەوەی مامم دەیڵێت دەشێت بەڵای گەورەی بەسەردا بهێنێت، بەڵام کەس گوێی لێ نەگرتم. لە ڕۆژانی دواتردا جەمشید ئێمەشی ناچارکرد سەروبەرماڵ هەڵگرین و هەرجارە و لە مزگەوتێکدا لەگەڵیدا بڕۆین بۆ نوێژ. ئەوکات جەمشید چیرۆکی سافینازی تەواو لە یادکردبوو، بەڵام هەندێک خەڵک هێشتا چیرۆکەکەیان هەر لە یادبوو، هەتا کەسانێکی بێڕەوشت و بێویژدان «کە لەم شارەی ئێمەدا لە ژمارە نایەن» بەدەنگی بەرز تانەی ئەوەیان لێدەدا و دەیانگووت «تۆ مێردێکی خەڵەتاویت کە دۆستی ژنەکەی خۆتت لەماڵی خۆتدا ڕاگرتووە». جەمشید زۆرجار تێنەدەگەیشت خەڵک دەڵێن چی و چ جۆرە تانەیەکی تێدەگرن. من و سمایل چەند جارێک لە نوکەوە ژیانی پێشینەی خۆیمان لەگەڵ سافینازدا بۆ گێڕایەوە، تا کەم کەم هەندێک پارچە و وێنەی هاتەوە بەرچاو. هەڵهاتنی

سافیناز و دۆستەکەی، جەمشیدی زۆر غەمگینکرد. بەڵام وادیارنەبوو کە مامم بۆ حاڵی خۆی خەفەتبار بێت، بەڵکو پێدەچوو بۆ پاڵەوانی چیرۆکێک یان چارەنوسی کاراکتەری سریالێکی تەلەفزیۆنی یان هەر غەریبەیەک غەم بخوات، هەرجارێک لە حیکایەتکردنی چیرۆکی سافیناز دەبووینەوە، ئەو بەخەفەتەوە دەستی دەخستە ژێر چەناگەی و دەیگووت «وای جەمشید خان، وای جەمشید خانی بەستەزمان چیت بەسەر هات... وای داماو، وای داماو چیت لێقەوما»، بەڵام لەوە نەدەچوو خەفەت بۆ خۆی دەخوات.

من و سمایل بۆ ماوەیەکی کورت هێنامانە سەر ئەو بڕوایەی سەرەتا وەک ئیماندارێک خۆی بناسێنێت و لە فڕیندا زۆر پەلە نەکات. لە ماوەی مانگێکدا بە خۆمان و بەرماڵەکانمانەوە چەندین مزگەوتمان تاقیکردەوە، تادواجار لە مزگەوتی «دوو گومەز» کە ڕۆژانی هەینی پۆلێک دەروێش دەڕژانە ناوەڕاستی گۆڕەپانە گەورەکەی و دەیانکردە زیکر و تەهلیلە و زرک وەشاندن گیرساینەوە. دیمەنی دەروێشەکان مامە جەمشیدی سەرسامکرد و گووتی لێرەدا و لەگەڵ ئەم پۆلە دەروێشەدا دەستدەکەین بە پەیامی خۆمان. کە مەلای مزگەوتەکە چیرۆکی جەمشیدی بیست زۆر دڵی خۆش بوو، زۆر هانی مامی دا لە گۆڕەپانی گەورەی مزگەوتەکەدا ئەو توانا گەورەیەی خۆی کە خودا پێیبەخشیوە نیشانیبدات تا ئەوانەی گومانیان لە قودرەتی ئیلاهییە، باوەڕبهێنن. هەفتەیەک دواتر کە دەروێشەکان لە ئاهەنگی زیکر بوونەوە، مەلای مزگەوتەکە داوای لە خەڵک کرد نەڕۆن لە بەرئەوەی موعجیزەیەکی خودایی گەورە هەیە دەبێت ببینن. ئەو ڕۆژە من و سمایل وەک هەمیشە لە ناوەڕاستی مەیدانی زیکرەکەدا پەتمان ڕاکێشا و لە ناو هاواری نەڵاهونەکبەر

و سەلاواتداندا جەمشیدمان بەرزکردەوە، هەر جەمشید لە زەوی ترازا و بەرزبووەوە، ئیمانداران کردیانە بانگهەڵدان و تەهلیلەکردن. جەمشید لەسەرەوە بە کورتی چیرۆکی ژیانی خۆی بۆ حەشاماتە حەپەساوەکە گێڕایەوە و دواتر باسی ئەوەی کرد کە ڕۆژێک لە کەشکەشانی فەلەکدا خودای بینیوە و پێیگووتووە خۆت بۆ موسڵمانان دەربخە و پێیانبڵێ کە خودا فەرمانی پێداویت خەڵک بۆ ئیمان بانگهێشت بکەیتەوە. سەرسامی موسڵمانان و بڕوایان بە توانا و کەراماتی جەمشید بەئەندازەیەک بەهێزبوو، هەندێکیان باوەڕیان بە هەموو قسەیەکی خان دەهێنا و وەک جۆرە وەلی و خودناسێک سەیریاندەکرد کە لەم سەردەم و زەمانەدا بێوێنەبێت. ئیدی لەو ڕۆژەوە جەمشید هەموو هەینییەک لە هەوای مزگەوتی دوو گومەزدا دەفڕی و باسی چاوپێکەوتنەکانی نێوان خۆی و خودای دەکرد.

ئەوەی لەسەرەتاوە سەرەنجی من و سمایلی ڕاکێشا ئەوە بوو کە جەمشید هەموو پێنجشەممەیەک دیدارێکی داخراو و درێژی لەگەڵ مەلای مزگەوتەکەدا دەکرد کە ناوی «مەلا قاسمی گوڵشێران» بوو، مەلا لەوانەبوو کە دەیگووت لەم سەردەمەدا کە کوفر باڵادەستە و لە هەموو جیهاندا حوکم و حاکمییەتی گرتۆتە دەست، هەر هۆیەک ئیمان بەهێزبکات دەبێت بەکاریبهێنین. بەڵام ئەوەی لە مەلا قاسمدا سەیربوو بۆچوونە خەیاڵییەکانی بوو دەربارەی خودا و بەهەشت و دۆزەخ کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دەیخستنە سەری زاری جەمشیدی مامیشم. مەلا بەهەشتی وەک شارێک وێنادەکرد کە شەقامەکانی جوانن، کارەبا تێیدا ناکوژێتەوە، ئاو تێیدا نابڕێت، شتەکان تێیدا هەرزانن، لە هەموو سەر سوچێکدا پاقلاوەخانەیەکی خۆڕایی بەردەوام کراوەتەوە، ژنان جل لەبەر ناکەن و بەبێ ئەوەی حەبی مەنعیش

بخۆن منداڵیان نابێت و سیاسەتیشی تێدا نییە. واتە شارێک بوو لە هەموو شتێکیدا پێچەوانەی شاری ئێمە.

جەمشید هەموو هەینییەک، دوای نوێژی جەماعەت دەچووە سەرێ و لە ئاسمانەوە گووتارێکی سەبارەت بە دیدارەکانی لەگەڵ باری تەعالادا دەخوێندەوە، لەوێوە مەلا قاسم چ چیرۆکێکی بۆدانایە ئەوەی دەگێڕایەوە. لە چیرۆکەکانیدا باسی ئەوەی دەکرد چۆن چووە بۆ مەلەکوت و پلەپلە لەگەڵ فریشتەکاندا، بە ڕیواقە ڕوناک و نوسینگە ناکۆتا و ڕێگا درێژەکانیدا تێپەڕیوە، چۆن فریشتە داویەتە دەست فریشتە و چۆن چەند جارێک لە ڕێگا زۆرەکانی ناو عەرش و لە نێوان ئیدارە ئاڵۆزەکانی ئاسماندا ونبووە. من و سمایل تاکە کەسێک بووین دەمانزانی جەمشید شتی وەهای نەبینیوە و ئەو چیرۆکانە تەنیا خەیاڵاتی مەلا قاسمن و ئەو هەندێک درۆی خۆی دەخاتە سەر و دەیانگێڕێتەوە. جەمشید هەر هەفتەیەی باسی شتێکی دەکرد و لەسەفەرە مەلەکوتییەکانیدا هەر جارەی وەسفی هەرێمێک و فریشتەیەکی بۆدەهێنایەوە. زۆرجار مامم لە هەوادا دەستیدەکرد بە گریان و دەیگووت «خۆزگە، خۆزگە لەو سەفەرانەدا ئێوەی ئیماندارم لەگەڵدا بووایە... تا بە چاوی خۆتان ڕێک و پێکی ئیشی خودا و جوانی عەرش و باق و بریقی زێڕ و زمڕودی مەلەکوت ببینن». جەمشید ناو بە ناو وەسفێکی ترسناک بەڵام شاعیریانەی دۆزەخی بۆ گوێگرانی مزگەوتی دوو گومەز دەکرد، کە دەگەیشتە وەسفی ئازاری خودانەناسان لە دۆزەخدا، شتەکانی وەها کاریگەر و بەجۆش دەهۆنییەوە، خەڵک لەگەڵ ئەودا بەکوڵ دەگریان و ئاگری ئیمان لە دڵیاندا کڵپەی دەسەند. تا دەهاتیش ژمارەی گوێگرانی مامم زۆرتر و زۆرتر دەبوون، بەجۆرێک حەوشی مزگەوتەکە نەیدەکێشا و کۆڵانەکانی

تەنیشتی مزگەوتەکەش نەیدەگرتن. دواتر سمایلی مامم گووتی ئەو چیرۆکانەی جەمشید لە هەوای مزگەوتی دوو گومەزدا دەیگێڕێتەوە تێکەڵەیەکی گەورەن لە چیرۆکەکانی فیرجیل و رسالة الغفرانی ئەبوعەلای مەعەری و کۆمیدیای خودایی دانتی، کە ئاشکرا مەلا قاسم شتێک لە فەنتازیاکانی خۆی بۆ زیادکردوە و خستوێتییە سەر زاری مامم. جەمشید هەمیشەش بەوە کۆتایی بە گووتارە دینییەکانی دەهێنا و دەیگووت «عەبدی بچوکتان جەمشید خانی کوڕی حیسام خان، لە کۆتایی گەشتەکەیدا لە ئاسمان چاوی بە باری تەعالا کەوتەوە، زاتی موبارەک و موقەدەسیان ڕێگایان بە عەبدی داماوی خۆیان دا کورت بە دیداریان شاد ببێت و گووتی بە ئوممەتی ئیسلام بڵێ کە دەبێت ڕەچاوی ئەم شتانەبکەن: ...». ئینجا جەمشید دەستیدەکرد بە گووتنەوەی ئەو ئامۆژگاریانەی کە بەشی هەرە زۆریان پەیوەندیان بە بیرکردنەوە و تەفسیرەکانی مەلا قاسم بۆ دینەوە هەبوو، وەک ئەوەی موسڵمانان سەیری سەتەلایت نەکەن، ژنەکانیان فێری شۆفێری نەبێت، شت بە گران نەفرۆشن، کچەکانیان نەبن بە پۆلیسی هاتوچۆ و ژمارەیەکی زۆری دیش لەم داواکارییە نابەجێ و سەیرانە. جارێک جەمشید خان لە هەوادا لیستێکی درێژی لە گیرفانی دەرهێنا و گووتی کە باری تەعالا حەرامیکردوە پیاوان ئەم شتانە بکڕن: جلی ژێرەوەی ژنان، حەبی ڕێگرتن لە سکپڕی، کەرەستەی ئارایشت، کامێرای فیدیۆ، هەروەها حەرامیکردوە ژنان بێئاگاداری مێرد و کەسوکاریان موعامەلەی سەفەر لەگەڵ قاچاخچیدا بکەن، بچن بۆ لای خەیاتی پیاو، سالۆنی قژبڕین بکەنەوە، خەیار بکڕن، یان بە تەنیا سوار تاکسی ببن. ئەوەی سەیربوو ئەوەبوو، قسەکانی جەمشید کە هەمیشە مەلا قاسم خۆی بە گووتارێکی ئاگرین دژ بە کافران و عارەقخۆران کۆتایی پێدەهێنا، کاریگەرییەکی

گەورەی لەسەر خەڵکی ئیماندار هەبوو کە حەرف بە حەرف قسەکانی ئەویان جێبەجێدەکرد. جارێکیان کار گەیشتە ئەوەی جەمشید لە ئاسمانەوە دوو لیستی جیاوازی بۆ عەتر خوێندەوە، یەکێکیان ئەو عەترانەی کە دەبێت خەڵکی بەکاربنەهێنن چونکە بۆنەکەیان بۆ ئیمان خراپە، ئەوی دیان ئەو عەترانەی کە پێویستە موسڵمانان لە خۆیانی بدەن چونکە ئیمان بەهێزدەکەن. دواتر دەرکەوت ئەو مەسەلەیە پەیوەندی بە بەرتیلی بازرگانێکەوە بۆ مەلا هەبووە، تا بازاڕی خۆی گەرمبکات و خێری عەترفرۆشەکانی دی بشکێنێت.

ئاگادارییەکانی من بۆ جەمشید سوودێکیان نەبوو، من دەشمزانی ئەمجۆرە وتارانە تا ئەبەد بەردەوام نابن، بەڵام لە ڕاستیدا جەمشید لەزەتێکی زۆری لەو ڕۆڵە دەبینی کە دەیگێڕا، هەمیشە ریشە درێژەکەی بە شانە دادەهێنا و جبەیەکی ڕەشی لە خۆیەوە دەپێچاو و زۆربەی کات لە ژوورەکەی خۆیدا خەریکی خەتمکردنی قورئان بوو. ناوبانگی لە ناو خێزان و دەرودراوسێ و خەڵکی بازاڕدا تا دەهات باشتر دەبوو. هەر پرسیارێکمان لێبکردبایە بە ئایەتێکی قورئان وەڵامیدەدایەوە، هەندێک ڕۆژ ئێمەی دەبردەوە بۆ پێدەشتەکانی دەرەوەی شار و بە پەت تا کەشکەشانی ئاسمان بەرماندەدا، بەجۆرێک بە راستی لە چاوان وندەبوو، کە دواتر داماندەگرتەوە دیسان لەرزی ئیماندارێکی لەخۆی دەهێنا و دەیگووت لە حزوری باری تەعالادا بووە. من دەمزانی جەمشید ئێستا بەڕاستی ئیمانی بە خودا هەیە، دەمزانی لە کاتی بەرزبوونەوەدا بۆ باڵا تووشی هەندێک دۆخی تایبەتی دەرونی دەبێت کە جیاوازە لەو دۆخە دەرونییانەی کە ئێمە دانیشتوانی هەمیشەیی زەوی تووشی دێین. بەڵام دڵنیاش بووم جەمشید کەوتۆتە ژێر کاریگەری بڕواکانی مەلا قاسمەوە کە

پێیگووتووە گەر دونیا بەمجۆرە بۆ موسڵمانان وێنابکەیت، زووتر دەکەونە سەر رێی ئیمان. گەرچی سەیرکردنی من و سمایل بۆ ئیمان بەجۆرێکی تربوو، بەڵام دەبوو لەکاتی نوێژی جەماعەتدا هەمیشە لە ملاولایەوە نوێژبکەین و سەرێکی پەتەکانی کەمەریشی هەردەم لە دەستماندا بێت. دەرکەوتنەکانی خانی باڵدار لە مزگەوتەکەدا هێز و تینی ئەوەشی دایە کە جار جار بە خۆمان و رایەڵمانەوە لە ناو بازاڕ و قەیسەرییەکاندا بجوڵێین. گووتارە ئاسمانییەکانی مامم تا دەهات زیاتر خەڵکی بەرەو مزگەوتی دوو گومەز ڕادەکێشا، بەڵام دوژمنانی خانیش تادەهات زۆرتردەبوون و زیاتر دەنگیان بەرزدەکردەوە. ژمارەیەک لە مەلاکان و لەوانەی لەگەڵ هێزە ئیسلامییەکاندا کاریاندەکرد، خانیان وەک سیحرباز و بیدعەچییەک سەیردەکرد کە موسڵمانان لە رێگای جیهادی ڕاستەقینە لادەدات. وای لێهات لە هەندێک مزگەوتی دیبەوە کەوتنە باسی کافر و سیحربازێکی لادەر کە بانگەشەی ئەوە دەکات دەفرێت و لە مەلەکوت چاوی بە باری تەعالا دەکەوێت، هەموو مەلاکان لەسەر ئەوە کۆبوون کە خودای گەورە تەنیا زۆر بە کەمی و لە هەندێک بۆنەدا و لە ژێر هەلومەرجی زۆر تایبەتیدا چاوی بە پێغەمبەر و ڕەوانەکراوانی خۆی کەوتووە، ئێستا ئەم جەمشیدە ئەهلی چ کافرستانێکە تا ئیدعای ئا لەم چەشنە بکات.

من هەوڵێکی زۆرمدا کە جەمشید خان بێنمە سەر ئەو ڕایەی وازبهێنێت و ماوەیەک بۆ گۆڕینی هەوا و خاوکردنەوەی مەیل بچینە بارانۆک و خۆمان بە گەڕان و تەماشای سروشتەوە خەریکبکەین، بەڵام کاری وەها لەگەڵ جەمشیدا ئەستەمبوو. جەمشید خان باوەڕی وابوو تا مردن بانگەشەی ئیمان دەکات و پەیامێکی خودایی پێیە کە دەبێت بیگەێنێت.

ئیدی ڕۆژێکیان ئەوە ڕوویدا کە هەر دەبایە ڕوویبدایە. یەکێک لەوانەی کە هاتبوون بۆ گوێگرتن لە وتارەکانی جەمشید لە خوارەوە هاواری لێکرد «هێی تۆ جەمشید خان، گوێبگرە... تۆ کابرا، خۆت چیت و جورمت چییە تا خودای گەورە بابایەکی کۆنە کافری وەک تۆ ببینێت... شەرم لەم درۆیانە ناکەیت. ئەوەی تۆ دەیڵێیت کوفرە، تا نەهاتووم و بە شەق دامنەگرتوویت، خۆت وەک پیاو لەو پەتە وەرەخوارێ و واز لەم سیحر و شەعوەزەکارییە بهێنە». جەمشید لە هەوادا وەڵامیدایەوە «هێی کابرای بێعەقڵ، بۆ لە تۆ وایە خودای گەورە خۆی پیشانی عەبدی خۆی نادات. دوائەوە ئەوەی من لە باری تەعالام بیستووە و ئەوەی من لەزاری ئەوەوە گێڕاومەتەوە لەگەڵ هەموو کتێبە ئاسمانییەکاندا کۆک و گونجاوە. گەر دەتەوێت من بە درۆ بخەیتەوە وەرە سەرەوە و لەگەڵمدا بفڕە. گەر تۆ باوەڕت بە موعجیزەی ئیلاهی نییە، ئەی کابرای گەمژە تۆ باوەڕت بە چییە. دە بابای بێمێشک گەر دەتوانیت، پەتێک لە خۆت ببەستە و سەرکەوە بۆلام ... بزانە لەگەڵ خۆمدا تا عەرشی عەزیمت دەبەم یان نا». ئەو ڕۆژە شەڕە قسەیەکی درێژ لە نێوان جەمشید و ئەو کابرایەدا ڕوویدا کە سەرەتای ئەو ڕەوتە چەوتە بوو کە جەمشیدی تێکەوت.

ڕۆژان و هەفتەکانی دواتر بە کۆمەڵ نامەی هەڕەشەمان بۆ دەهات، هەندێک خەڵکی نەناس لە بەرەبەیانێکی زوودا کاتێک مەلا قاسمی گوڵشێران لە نوێژی بەیانی دەگەڕایەوە پەلاماریاندا و کەمێک زامداریانکرد، هەندێک لە گروپە دینییە توندڕەوەکان جەمشید خانیان بە کەسێکی وەک موسەیلمەی درۆزن دەشوبهاند و فەتوای تەکفیریان بۆ دەرکرد. تا دواجار لە ڕۆژێکی هەینیدا کە جەمشید تازە لە هەوادا خەریکبوو سەری قسەی

دادەمەزراند، دوو چەکدار لە ناکاو بازیاندایە ناوەڕاستی مەیدانی زیکرەکە و یەکێکیان کەوتنە تەقەکردن بە ئاسماندا و ئەوی دیان دەستڕێژێکی بە ئاراستەی من و سمایل تەقاند، هەردووکمان پەتەکەی جەمشید خانمان لەدەست بەربوو و بەلادا کەوتین، لە تەنیشتمانەوە کوڕێکی گەنج و پیاوێکی پیر پێکران. دوو چەکدارەکە هەر بەدەم تەقەوە دریان بە حەشاماتەکە دا و لەدەرگای سەرەکی مزگەوتەکەوە بۆی دەرچوون.

شتەکان بە چەشنێک خێرابوون و دەنگی دەستڕێژەکان بەجۆرێک لە گۆڕەپانی گەورەدا دەنگیاندایەوە من تا دوای هەڵهاتنی دوو چەکدارەکەش هەر ساکابووم و نەمدەزانی چی ڕوویداوە. کە سەرم بەرزکردەوە بینیم خوێن لە ئاسمان دێتە خوارێ. با ئەو ڕۆژە زۆر بەهێز نەبوو، جەمشید کە لەدەستی ئێمە بەربوو، هەر لە ئاستی خۆی کەمێک بەلای چەپدا جوڵاو و گومەزی مزگەوتەکە گرتییەوە، لەوێدا بە زامداری، بەڵام کەمێک بە کاوەخۆ هەوا دایگرتە خوارەوە. من و سمایل جەمشید خانی زامدارمان گرتەوە و بینیمان گوللەیەک شانی چەپی پێکاوە و خوێنێکی کەمیشی لەبەردەڕوات کە بۆ لەشی ئەو زۆر و بۆ مان و نەمانیشی گرنگ بوو.

جەمشیدمان لەگەڵ بریندارەکانی دیدا برد بۆ بیمارستان. ئەو فیشەکەی جەمشیدی پێکابوو، وەک ئەوەی کاغەزێک ببڕێت لە شانییەوە دەرچوو بوو. دکتۆرەکان دۆخی جەمشیدیان بە ترسناک حیساب نەکرد، بەڵام گەرچی زامەکەشی کوشندەنەبوو، کەچی تا چوار ڕۆژ هۆشی نەهاتەوە سەر خۆی. لە ئێوارەی چوارهەمین ڕۆژدا کە چاویکردەوە یەکەمین کەس کە لەسەر سەری بوو من بووم. بەلاوازی دەستی خستە ناو دەستم و بە دەنگێکی نزم و نیگای پیاوێکی تادار لێیڕوانیم و گووتی «سالار

خان، جانتاکانمان کۆکەرەوە، دەبێت تازووە ... تازووە ئەم وڵاتە گووە جێبهێڵین». تا لە بیمارستان دەرچوو، ئەوە تەنیا ڕستەیەک بوو بەردەوام دووبارەیدەکردەوە.

ئەو گوللانە کارێکیانکرد، بۆ هەتاهەتایە خوداشی لەبیربچێتەوە.

## سەفەرەکانی جەمشید خان

جەمشید لەو ساتەوەی کە هۆشی هاتبووە بەر خۆی یەک خەیاڵ هەموو ژیانی داگیرکردبوو، کە بڕۆین و لەم وڵاتە دووربکەوینەوە. جارێکیان خۆی بە منی گووت «مرۆڤ کە لە بەرزاییەوە سەیری ئەم نیشتیمانە دەکات، بێئاگای خۆی کۆمەڵێک وێنە لە ڕۆحیدا گەنجینە دەبێت، کە لە کات و ساتی خۆیدا مانایەکی ئەوتۆیان نییە... بەڵام دواتر ئەو وێنانە مرۆڤ بەرەو شتێک ڕادەکێشن کە خۆشی چاوەڕوانی نەکردوە». هەفتەیەک دوای دەرچوونی لە خەستەخانە، دوا شتێک کە مابووی خانوویەکی چکۆلانەبوو، ئەوەی فرۆشت و بەپارەکەی تەدارەکی سەفەری ئامادەکرد و جلی نوێی بۆ خۆی و من و سمایل کڕی و گووتی «کاتی ئەوە هاتووە بڕۆین و لە وڵاتێکی دی شانسی خۆمان تاقیبکەینەوە». سمایل کە باوەڕی نەدەکرد، لەو دەستڕێژ و گوللە بارانەی مزگەوتەکەدا سەلامەت گیانی دەرکردوە، ئێستا زۆر لەوە دەترسا دووبارە تووشی ڕوداوێکی تری وا کوشندە ببێتەوە، لەبەرئەوە ڕای وابوو، لێگەڕێین ئەمجارە خانی مامم کەسانێکی تر وەک یاوەر و هاودەم بدۆزێتەوە ... ئەو گووتی دەنگێک لە قووڵایی دڵیدا پێیدەڵێت دوای خولیای ئەم سەفەرەی ئەو نەکەوێت،

چونکە واهەستدەکات تووشی بەڵایەکی گەورە دەبێت. سمایل ئەوکات بۆئەوەی پێش لەو پێشبینییە بگرێت لەگەڵ ئێمەدا نەهات و بڕیاریدا لە نیشتیمان بمێنێتەوە. من بە پێچەوانەوە، زۆر حەزمدەکرد ئەم وڵاتە بەجێبهێڵم و بڕۆم، جگە لەوە ئەو هەموو ساڵە بەردەوام لە غەمی جەمشید خاندا بووبووم و ئێستا نەمدەویست هەروا ئاسان دەستبەرداری ببم. سمایل بە هۆی نوقمبوونی لە جیهانی خوێندنەوە و نوسیندا دەیویست ببێتە ڕۆژنامەنوس، بە مامی گووت کە ناتوانێت لەم وڵاتە دەرچێت و هەر لە سنوور چوو بەودیودا لەوانەیە نەخۆشییەکی نەزانراو یان ڕوداوێکی ترسناک بیکوژێت. ئەو ساڵانەی دوایی سمایل تەواو لە زمانی ئینگلیزیدا قووڵ بووبووە، ئەگەر سەرقاڵی زۆری نەبایە لەگەڵ جەمشید خاندا کە زوو زوو هەموو کاروبارێکی لێدەپچڕان، حەزیدەکرد لەگەڵ ڕێکخراوێکی بیانییدا کاربکات و ژنبهێنێت. من بەراورد بەو کەسێکی بێهیوا و بێئامانج بووم، ئەوەندەی دەمویست کات ببەمەسەر هیچی دیم مەبەست نەبوو... هێندەی ڕۆژەکانم تێدەپەڕاند ئەوەندە نەدەژیام. وەک شتێک لە قووڵایی ڕۆحمدا بڕیارمدابوو ژیانی خۆم بۆ مامم تەرخانبکەم. بەڵام گەرچی من هەموو ژیانی خۆم بەو بەخشیبوو، ئەو منی تەنیا وەک ڕایەڵگرێک دەبینی کە دەبێت هەبم و ئەو پەتە بگرم و بێورتە لە خزمەتیدابم. دواجار خۆم وەک ئەو کۆیلانە دەهاتە پێشچاو کە لە بنی کەشتییە کۆنەکاندا هەمیشە سەوڵیان لێدەدا و کەسیش نەیدەبینین. هەستمدەکرد دەوروبەرم منیان وەک مرۆڤ بیرچۆتەوە و تەنیا وەک ڕایەڵگری خان دەمبینن و جگە لەو ڕۆڵە، ناتوانن لە هیچ بەرگ و ئیشێکی تردا بمخەنە پێشچاوی خۆیان. هەتا سەرفراز خانی باوکم، بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە جگە لەوەی جار جار ئامۆژگاریدەکردم ئاگام لە مامم بێت، یەکجاریش باسی ژیان و پاشەڕۆژی خۆمی لەگەڵدا

نەکردم. ئەو ڕۆژەی بڕیارمدا لەگەڵ جەمشید خاندا بڕۆم بۆ دەرەوەی وڵات، کەسوکارم هەر وەک ئەو یاوەرە ئەزەلییە تەماشایاندەکردم کە دەبێت جەمشید خان بەزەوییەوە بنووسێنم، ئەو شەوەش کە بۆبەیانی سەفەرماندەکرد، هەموو پەیتا پەیتا هاتن و گووتیان کە دەبێت ئاگام لە مامم بێت. بەیانی کە بەرەو سنووری تورکیا و بە ئاڕاستەی زاخۆ سوار پاسێکی کۆستەربووین، نە من و نە ئەو نەماندەزانی دەچین بۆ کوێ و نیازی چیمان هەیە، هەردووکمان دەمانویست بچینە ئەودیو سنووری وڵات و لەوێ دووبارە بیربکەینەوە. جەمشید گووتی «تا لەسنووری ئەم وڵاتەدا بین ناتوانین بیربکەنەوە، هەواکەی بە عەقڵ ناکەوێت، دڵنیام لەو دیو سنوور ئیلهامی زیاترمان بۆ دێت». لە پاسەکەدا جەمشید خان باسی زۆر شتی بۆکردم، بەڵام لە هەر شت زیاتر دەیگووت حەزدەکات سەروەت و سامانێکی زۆر کۆبکاتەوە و خۆش بژی و ئەو هەموو ڕۆژە تاڵانەی ڕابوردوو لە بیربکات. جەمشید لەو کاتەوەی لە مزگەوتەکەدا بە بریندارى هاتەخوارێ، هەرکات باسی خودام بۆدەکرد و چیرۆکی سەفەرەکانی مەلەکوتی خۆیم بۆ دەگێڕایەوە، زەردەخەنەیەکی ئاڵۆزی دەگرت و سەیرێکی دەکردم و باوەڕی نەدەکرد. ئێستا جەمشید جگە لە باسی ژیانی خۆشگوزەران و سەفاکردن، خەیاڵی دیکەی نەبوو.

من دڵنیابووم ئەو پارەیەی پێمانە لە هیچ جێگایەکی دونیادا بەشی ژیانێکی خۆش ناکات ، بەڵام جەمشید دەیگووت ئێمە کاردەکەین و سامانێکی زۆر بەیەکەوە دەنێین و دووبارە هەموو ئەو خانوو و موڵکانە دەکڕینەوە کە لەدەستماندراوە و ئەوەی لە تەمەن ماومانە بۆ کەیف و ڕابواردن بەکاریدەهێنین. بەڵام من بە ڕاستی نەمدەزانی مامم لە وڵاتێکی غەریبەدا دەتوانێت چ کارێک

بکات و چۆن بژی، گومانیشم هەبوو بتوانین لەو شار و میترۆپۆلە گەورانەدا پەت ببەستین و بە ئاسماندا بفڕین. لە زاخۆوە قاچاغچییەکەمان بە سێ شەو ئاودیوی تورکیای کردین، من لە هەموو ڕێگاکەدا جەمشید خانم لە باوەشدا بوو. کێوەکانی سەر سنوور بە شەو سارد و بادارن، ئەو دەبایە خۆی توند بە ملمەوە بنوسێنێت تا با نەیبات، هەندێجار لە باوەشمدا دەخەوت و هەندێجار ڕادەچڵەکی و بەترسێکەوە دەیپرسی «ژەندەرمەکان ئێمەیان نەبینی ؟ ئێمەیان نەبینی ؟». من یەک کۆڵەپشتم پێبوو کە دۆلارەکانمان و پەتێک و هەندێک خورما و زەرفێکی گەورە فستقی تێدابوو، جەمشید گیرفانەکانی خۆشی پڕکردبوو لە فستق و لەبەرەوە دەیخوارد. بەربەیانێک گەیشتینە سلۆپی و سوار پاسی ئەستەمبول بووین، قاچاغچییەکەمان کە کاری کڕینی بلیتی پاسەکەی بۆ جێبەجێکردین، هێندەی جەمشیدی لە سەر کورسیەکەی خۆی دانا، منی بانگکردە خوارێ و بە کرمانجییەکی ڕوون گووتی «ئەم مامەی تۆ زۆر نەخۆشە، ئەمە لە ڕێگای یۆنان دەمرێت و بەرگەی ئەو دەردەسەرییە ناگرێت، گەر دەتەوێت بیبەیتەوە بۆ شاری خۆت، من کارئاسانیتان بۆ دەکەم». من قسەکانی ئەوم بۆ مامە جەمشید گێڕایەوە، ئەو پێکەنی و گووتی بە «شۆفێرەکە بڵێ لێخوڕێت و جەواب بۆ گریکەکانیش بنێرە و بڵێ وا جەمشید خانی باڵدار هات ... بابڕۆین، با بڕۆین زۆرمان نەماوە بگەینە بن سێبەرەکانی ئەکرۆپۆلیس». جەمشید ئەو قسانەی کرد و وەک هەوای ئەودیو سنوور گۆڕیبێتی، بە فەخرێکەوە کە پێشتر کەم لە ڕوخساریدا بینیبووم لە پەنجەرەی پاسەکەوە سەیری دەرەوەی کرد. لە ئەستەمبول توانایەکی تری جەمشید خانم بینی کە پێشتر نەمدەزانی و دەرکم پێ نەکردبوو، مامم زمانێکی ئاماژەی وەهای بەکاردەهێنا هەموو کەس تێیدەگەیشت. من و خان کەسمان

تورکیمان نەدەزانی، تورکەکانیش لە تورکی بەولاوە زۆر کەم زمانی تر دەزانن، بەڵام بە هۆی ئەو توانایەی جەمشیدەوە تووشی کێشەی گەورە نەبووین. من وام بە باش دەزانی کە زۆر لەو کوردانەی دی دوورنەکەوینەوە کە بە هەزاران هەزار لە باکووری عێراقەوە دەڕژانە ئەستەمبولەوە و بەپێ بەرەو یۆنان دەڕۆیشتن و دواتر لە کۆمەڵێک شاحینە و بەلەمی شکاودا بەرەو ئیتالیا دەپەڕینەوە، ئەوان زۆربەیان لە شوقەی چەپەک و نهێنیدا دەژیان کە قاچاغچییەکانیان لە ماڵ و شوێنی تایبەتدا دەیانگرت. خان ڕای وابوو ئێمە پارەیەکی زۆرترمان لەوان پێیە و باشترە خۆمان بەدووربگرین و لەسەرەتاوە خۆمان وەک «لات و لومپن دەرنەخەین». من کە هەستم بە کەساسی و دەستەوەستانی دەکرد، مەچەکی جەمشیدم بە پەتێکی قایم بە خۆمەوە بەست و لە شەقامەکانی ئەو میترۆپۆلە خورافییەدا ونبووین. یەکەمجار لەوێدا من دەریام بینی، جەمشید هەوای کەنار مەستیکرد و دیمەنی بێسنووری ئاو لە نزیکەوە خستییە سەر دۆخێکی سەیر و هەردووکمان ڕەنگی شینی دەریا بۆ خۆی فڕاندینی. ڕۆژی یەکەم تا شەو داهات لە سەر بەردێک لە ڕۆخی دەریادا دانیشتین و سەیری بەلەمی ماسیگرەکانمان کرد. کە شەو داهات بە جەمشیدم گووت بابڕۆینەوە ناو ئەستەمبول و شوێنێکی خەو پەیدابکەین. بەڵام جەمشید ڕازی نەبوو، گووتی با بەشەو لە نزیکەوە سەیری ئاو بکەین، من بەقسەمکرد و هەر دانیشتین و دانیشتین... من و ئەو پێنج ڕۆژ بەوجۆرە لە کەنار دەریادا ماینەوە و تەنیا سەیری ئاومان دەکرد. پێنج ڕۆژ تەنیا ئەو فستق و خورمایەمان خوارد کە لە کۆڵەپشتەکەماندا مابوو. ئێوارەی ڕۆژی پێنجەم جەمشید گووتی «وای خوایە ئەمە چ دەردێکە، من لەسەیرکردنی بەحر تێرنابم... هەستە و بابڕۆین، بابڕۆین، من دڵنیام کاتێکی زۆرترم دەوێت بۆئەوەی لەم ئاوە

تێبگەم». دوای پێنج ڕۆژ ئێمە تویکڵی فستقەکەی خۆمان و ناوکی خورماکانمان خستە دەریاوە و چووینەوە ناو ئەستەمبول. جەمشید لە ماوەیەکی کەمدا دوو پیری کرمانجی دۆزییەوە و تێیگەیاندن کە پێویستیمان بە ژوورێک یان ماڵێکی کرێ هەیە. بینینی دوو کوردی باشوور دڵی پاکی کرمانجەکانی خۆشکردبوو، دەیانزانی ئێمە لە پۆلیسی تورکی قاچاغین و دەبێت بمانبەنە شوێنێکی ئەمینەوە. ئەوان کۆمەکیانکردین ژوورێک لە ژێر خانێکدا پەیدابکەین کە هەندێ فرۆشیار و دەستگێڕی هەژاری کرمانجی تێدا دەژیان، شوێنەکە لەگەڵ خەونەکانی جەمشیددا دەربارەی ژیانی خۆشگوزەران و و کەیفکردن تەبا نەبوو، بەڵام وەک سەرەتا شتی دیمان چنگ نەدەکەوت. کرمانجەکان هەر ئەو شەوە دوو قەرەوێڵە و دوو دەست نوێنیان بۆ پەیدا کردین و من و خانی مامم بۆ ماوەی شەو ڕۆژێک بێوچان خەوتین.

پەیوەندیمان لەگەڵ کرمانجە دەستگێڕەکان و کرێکارە هەژارەکانی ناو ئەستەمبولدا خێرا گەشەیکرد، من دەمتوانی هەندێک ڕۆژ بۆ پیاسەیەکی کورت جەمشید خانیان بدەمەدەست و فێری ئەوەیان بکەم چۆن بە خۆیانەوە بیبەستنەوە. مامیشم خۆی پێیخۆش بوو جارجار من نەبینێت و ڕایەڵدارێکی دیکەی هەبێت. کرمانجەکان پیاسەکردنیان لەگەڵ ئەم پیاوە لاوازەدا کە هیچی لە مەخلوقێکی زیندوو نەدەچوو بە ئەزموونێکی نوێ و گەمەیەکی منداڵانە دەزانی. جەمشید لە ماوەیەکی کەمدا دۆست و برادەری تورک و کرمانجی پەیداکرد و فێریشبوو لە پاڵ زمانی ئامازەکەی خۆیدا، کۆمەڵێک ڕستە و گوزارەی گرنگ بە هەردوو زمانەکە بڵێتەوە کە بۆ تێپەڕاندنی ژیان لە شارێکی وەک ئەستەمبولدا کارئاسانییەکی گەورە بوو. شەوێکیان کوڕێکی کرمانج کە ناوی فەیسەڵ بوو، ئێمەی برد بۆ شەقامێک کە پڕبوو

لە سۆزانی تورک، ئافرەتانێک لە جلوبەرگی وەهادا من و جەمشید پێشتر لە خەویشدا نەماندیبوو، من لە شاری خۆم و لەو جێگایانەی دیدا کە لە باشووری عێراق تیاژیابووم ئەو هەموو سۆزانییە جوانەم پێکەوە و بەیەک تۆپەڵ نەبینیبوو، سۆزانییە بەستەزمانەکانی شارەکەی من بەجۆرێکی تر و لە ژێر باری ترس و هەلومەرجێکی سەختی کاردا دەژیان کە جیاواز بوو لە ژیانی ئەم سۆزانییە ئازاد و بێترس و بەختەوەرانەی ئەستەمبول کە خۆشیان لە ئیشەکەی خۆیان دەبینی... ئەوە ئەو شەوە بوو کە بەتەواوەتی جەمشیدی گۆڕی ... شەوێک بوو هەوا نەدەجوڵا و شەماڵ بێ کزە خەوتبوو. بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە جەمشید ئەو توانایەی تێدا دروستبووبوو کە بتوانێت هەستێکی پێشوەختی بە جوڵەی هەوا و بەرگەگرتنی لەشی خۆی هەبێت، ئەو کاتانەی دڵنیادەبوو هەوا خەوتووە و دەتوانێت بێترس و بەتەنیا بڕوات دەیویست زۆرترین کەیف لە جوڵەی ئازادی خۆی وەربگرێت. ئەو شەوە لەو شەوانەبوو کە دەیویست کەیفبکات و بژی، گەرچی پێشتر نەمدیبوو بخواتەوە، بەڵام بێباک یەک لەسەر یەک شەرابی هەڵدەپچڕی و هەڵیدەدا، کە لای من هەم ترسناک و هەم بێئاوەزی بوو، چونکە من بزانم جەمشید توانای لەشی خۆی لەسەر مەی تاقی نەکردبووەوە. سەیربوو لەلام کە خان ئەوشەوە بێباک دەیخواردەوە و کەچی جگە لە مەستییەکی خۆشهەوا کاری دیکەی تێ نەدەکرد. فەیسەڵ دواجار من و جەمشید خانی برد بۆ ماڵێک پڕبوو لە کچی زۆر گەنج و جوان و گووتی ئێرە ناوازەترین جێگای ئەستەمبولە و دەتوانین لەگەڵ چ کیژێکدا دەمانەوێت بخەوین، من کە دەموچاو و نیگای یەکەمین کیژم بینی، کە یەکەمین خەندەی دەستکردی ئەو کەوتە بەرچاوم، بێئەوەی بزانم بۆ، لەوێدا بڕیارمدا تا مردن لە هەر جێگایەک و لە هەر شوێنێکی دونیادا بم لەگەڵ هیچ سۆزانییەکی

سەر ئەم ئەستێرەیەدا نەخەوم. جەمشید خان ئەو شەوە چووە ژووری و تا دەمەوبەیان نەهاتەدەرێ، من لەدەرەوەی خانووەکە و لەسەر شەقامەکە وەستام و تەنیا سەیری ڕێبوارەکانم دەکرد.

ئیدی ئەو جۆرە شەوانە لە ژیانمدا زۆر دووبارەدەبنەوە، شەوانی چاوەڕوانی دووروودرێژی لە بەردەم یانەکانی شەو و بارەکان و سەنتەرەکانی لەشفرۆشیدا، تاکە شتێک لەو شەوانەدا فێریبووم جگەرەکێشان بوو، هەمیشە پاکەتێکم دەکڕی و پاڵم دەدا بە دیوارێکەوە و جگەرەم دەکێشا. هەر لەو شەوانەشدا دیسان ئەو خووە دێرینەی جاران فێربوومەوە کە سەیری ئاسمان بکەم... سەیرکردنی ئاسمان نیشانەی داگەڕانی هەمیشەیی ژیانم بوو بەرەو بۆش و بەتاڵییەکی بێسنوور، بەڵام بەتاڵییەک کە بەڕاستی حەزم لێدەکرد و کێشەی گەورەم لەگەڵیدا نەبوو.

دوای مانگێک پارەکانمان بەرەو کزی دەڕۆیشت، ئەوەی پێمانبوو جەمشید خان زۆربەی لای ژنە لەشفرۆشەکان خەرجکرد، من ڕۆژێک بە جەمشیدم گووت کاتی ئەوە هاتووە مشوری سەفەر بخۆین و واز لەمجۆرە ژیانە بهێنین و قاچاغچییەک بدۆزینەوە بمانبات بۆ یۆنان. خان بێباک دەرهەق بە ترس و دوودڵی من گووتی «مەترسە، من هەموو شتێک جێبەجێدەکەم». بەوەدا ئەو شەوان تابەیانی دەمایەوە و منیش دەبوو وەک پاسەوان لە بەر بای ساردی شەودا چاوەڕوانیبکەم، زۆربەی کات کە دەگەڕاینەوە ماڵەوە، من وەها وەڕس و ئەو وەها مەست و ماندووبوو توانای قسەکردنمان نەبوو. بە ڕۆژ هەردووکمان تا درەنگ دەنوستین، ئێوارانیش کە هەڵدەستاین جەمشید هەردەم مەزاجێکی خراپی هەبوو، کەم قسەیدەکرد، زۆر لەبەردەم ئاوێنەی دەستشۆرەکەدا دەوەستا، چەندجارێک ڕیشی دەتاشی، چەندجارێک ددانی دەشت، بەردەوام تفیدەکرد، زووزووش لە

پەنجەرەکەوە دەستی دەبردە دەرێ بۆئەوەی بزانێت هەوا چۆنە. کەم قسەی لەگەڵ مندا دەکرد یاخود لە ڕاستیدا هەر قسەی لەگەڵدا نەدەکردم.

شەوێک لە شەوان، لە خانەیەکی خواردنەوە و لەشفرۆشیدا کە ماڵی مەنسورە هانیمیان پێدەگووت، شوێنێک بوو بە کریستاڵ و پەردەی سوور و دیکۆری شێوازی عوسمانلی ڕازابووەوە، لە پشتیشەوە حەمامێکی تورکی گەورە هەبوو. مامم لە ناو هەڵم و هاڵاوی ئەو حەمامەدا قەرەبیبەری ناسی، ناسینی قەرەبیبەریش ژیانی ئێمەی لە بنەوە گۆڕی.

قەرەبیبەر پیاوێکی سەرڕووتاوەی بچکۆلەبوو کە دۆستایەتییەکی نزیکی لەگەڵ زۆربەی ئەفسەرە بەرزەکانی ناو پۆلیسی ئەستەمبولدا هەبوو، بە ئوتومبیلێکی زۆر تازە و گرانبەها هاتوچۆیدەکرد، پەیوەندی بە دوو قاچاغچی گەورەی کوردەوە هەبوو یەکێکیان مستەفا قەسابی ناوبوو، ئەویتریان خۆی کورد بوو کەچی لەوێ بە «بورهان ئۆکیوز» بانگیاندەکرد. هەردووکیان دوو چەقۆ وەشێنی دڕندەبوون، چەندەها ماڵی تایبەتیان هەبوو، بەوە بەناوبانگ بوون ئەوەی دەکەوێتە دەستیان وەک ئەوە وایە کەوتبێتە داوی دوو جانەوەری برسییەوە، تا ئەو کات چەندین کەس لەوانەی دەبوو ئاودیوی یۆنانیان بکەن لە بەحردا خنکابوون یاخود کەوتبوونەوە داوی ژەندرمی تورکییەوە و بەرەو عێراق ڕەوانەکرابوونەوە. هەردووکیان باکیان بە هیچ نەبوو، خەڵکی دەیانگووت لە ڕێگا کە خەڵک دەپەڕێننەوە لاقەی هەندێک لە ژنەکان دەکەن، گەر کچێکیان بەدڵ بێت لە ماڵە تایبەتییەکانی خۆیاندا گلیدەدەنەوە و ناهێڵن سەفەربکات، بەردەوام چەند پاسەوانێکی گەنجیشیان لەدەور بوو دەیانپاراستن. ئیشی قەرەبیبەر ئەوەبوو پارەیەکی

زۆر لەو دوو قاچاغچییە بستێنێت بۆئەوەی کاروباری ناو ئەستەمبول و سەرسنووریان بۆ ئاسانبکات. قەرەبیبەر ئاشکرا لە ئیشی ئەو جووتە کوردە ڕازی نەبوو، کە ناوبانگیان تادەهات لای پۆلیسی تورکی خراپ و لکەدارتر دەبوو، لەوەدەترسا گەر زیاتر کۆمەک بەوان بکات خۆشی جارێک لە جاران تێوەبگلێت و تیابچێت. بە جەمشید خانی گووتبوو گەر تۆ خەڵک پەیدابکەیت، هەموو ئیشەکە لە قەساب و ئۆگیۆز دەستێنینەوە و خۆمان هەموو کارەکە ڕادەپەڕێنین. ئەو پێشنیارە جەمشید خانی لە خۆشیدا مەستکرد، ئەوەتەی هاتبووە ئەستەمبول بۆ گورزێکی وەها دەگەڕا و چاوەڕێی دەرفەتێکی لەو چەشنە بوو.

بۆ ڕۆژی دوایی من و جەمشید چووین بۆ هەموو ئەو جێگایانەی کوردەکان تێیدا کۆدەبوونەوە و سێ گەنجی بێئیشمان گرت بە کرێ تا نەفەرمان بۆ پەیدابکەن. سەرەتا دەمانزانی لەگەڵ باندی قەساب و ئۆگیوز دا تووشی گێچەڵی گەورەدەبین. بەڵام قەرەبیبەر، خانی دڵنیاکردەوە و گووتی لەو بارەیەوە خەمی نەبێت و مەراقێک لەدڵ نەگرێت. دوای دوو ڕۆژ لەوە پیاوانی ئۆگیوز، لە چایخانەیەکی لێواری دەریادا، چەقۆ لە نەفەرێک دەدەن لەوانەی خۆی کێشاوەتەوە و دەیەوێت لەگەڵ ئێمەدا بەرەو یۆنان بڕوات. ئەوە بۆ قەرەبیبەر و پۆلیسەکانی ئەستەمبول بەسبوو هەردوو باندەکە بپێچنەوە و لە ماوەی چوار ڕۆژدا، لە ڕێگای زاخۆوە ئاودیوی سنووریان بکەنەوە. شکستی ئاسانی ئەو دوو باندە بە دەستی جەمشید خان، ناوبانگێکی خێرای بۆ ئێمە پەیداکرد، لە ماوەی هەفتەیەکدا مامم لە دەفتەرێکی تایبەتیدا پەنجا ناوی هەبوو، کە دەبوو بەزووترین کات بیانبەین بۆ یۆنان. من سەرەتا هەموو گەمەکە بە شێتی و سەرکێشییەک تێگەیشتم کە شانسی سەرکەوتنی هیچە. بەڵام

جەمشید خان گوتی ئیشەکە گەمەی منداڵانە و بەراورد بەوەی پێشتر لە ژیانیدا کردویێتی و بینیویێتی، ئاسانترین کارێکە ڕێی کەوتبێتە سەری.

ڕۆژێک من و جەمشید چووین و چی نەخشەیەکی تورکیا و یۆنان لە بازاڕدا هەبوو کڕیمان، دوای ئەوە دوو شەو نەچووینە دەرەوە و ورد و درشتی ئەو ڕێگایانەمان لێکدایەوە کە دەتوانین بیگرینەبەر. لە بەربەیانی شەوی دووهەمدا جەمشید گوتی «لە دونیادا هیچ ئیشێک لە قاچاغچێتی مرۆڤ بەردەوام و مسۆگەرتر نییە، تا مرۆڤەکان بەم چەشنەی ئێستا غەمگین بن، بەردەوام هەوڵدەدەن لە وڵاتی خۆیان ڕابکەن. چونکە ئەوەی ئینسان پێیوایە دەتوانێت لە شوێنێکی تر بەختەوەر بێت، کەرێتییەکە لە باوە ئادەمەوە بۆمان ماوەتەوە». ئەو شەوە جەمشید خان کەیفی قسەی هەبوو، گوتی دوای تێفکرینێکی زۆر گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە شتێک لە مێژوودا نییە، ناوی دەرکردنی ئادەم لە بە هەشت بێت، ئەوەی هەیە و نییە، ئەوەیە جەنابی «ئادەم ئەفەندی» لە بەهەشت هەستی بە بێزاری کردوە و ویستویێتی سەفەربکات، بەڵام بۆکوێ سەفەربکات، مرۆڤ لە بەهەشتدا دەتوانێت هەر بە چواردەوری خۆیدا بسوڕێتەوە، واتە لەمسەری باغێکەوە بڕوات بۆ ئەوسەر و بگەڕێتەوە. جەمشید دڵنیابوو ئادەم داوای لە خودا کردوە کە شوێنێکی تری بۆ دروستبکات، شوێنێک کە سەفەری بۆبکات و ڕێگای بداتێ جار جار لەوەڕزێ و دووبارەبوونەوەی ئەبەدی ناو بەهەشت دەرچێت. بەڵام خودا پێیدەڵێت بە یەک مەرج بەقسەتدەکەم کە تۆ لەو دار سێوە بخۆیت، چونکە ئەو سێوە وەها چاوی دەکاتەوە و تامێکی وەها سیحراویشی هەیە گەر ئادەم بیخوات ناتوانێت بەهەشت جێبهێڵێت. بەڵام ئادەم کە مەخلوقێکی بێمێشکە و حەزی لەوە

نییە فێری زانین و ماریفەت بێت، جەمشید خان واتەنی وەک خوێندکارێکی تەمەڵی ئەم دەور و زەمانەی ئێستامان وایە، سەرسەختیدەکات و میز بە داری ماریفەتدا دەکات و لێی ناخوات. ئیدی خودا ناچاردەبێت، زیرەکترین و مەکربازترین یاوەری خۆی کە شەیتانە بنێرێتە لای ئادەم تا وابکات لە سێوەکە بخوات و بەهەشت جێنەهێڵێت، بەڵام ئادەم هەر سووردەبێت لەسەر دوورکەوتنەوە لە بەهەشت کە بە شوێنێکی ناخۆش و بێژیانی تێدەگات. ئیتر کاتێک خودای گەورە دڵنیادەبێت ئادەم لە سێوەکە ناخوات و لە بەهەشت غەمگینە و تووشی غەمۆکییەکی هەمیشەیی هاتووە، بە ناچاری بڕیاردەدات لەدەرەوەی بەهەشت شوێنکی تری بۆ دروستبکات. بەڵام خودا قەت ئەم نمەک بەحەرامییەی ئادەمی بیرناچێتەوە و قەتیش لە شەیتان نابورێت کە نەیتوانی ئادەم والێبکات لەو داری ماریفەتە بچێژێت. جەمشید خان ڕای وابوو، ئێمە مەگەر بێدەماغێکی گەورە بین وابزانین ئادەم لەداری ماریفەتی خواردوە، هەر سەیرکردنێکی ڕوکەشی حاڵی مرۆڤ ئەوە بەیاندەکات کە مرۆڤ هەرگیز دەمی بۆ میوەی ئەو دارە نەبردوە و هەمیشە و هەمیشەش لە تاریکیدا ژیاوە و هەر لە تاریکیشدا دەژی. ئەو دەیگووت خودای مەزن زۆر لە ئادەم زویر دەبێت کە هەم نایەوێت لە بەهەشتدا بژی و هەم ناشیەوێت دەم لە میوەی ماریفەت بدات و سوورە لەسەر ئەوەی تێنەگات و بە بێمێشکی بمێنێتەوە. بەڵام چی بکات، خودای گەورە چی بکات، ئادەم وەک کوڕی خۆی وایە و نایەوێت لە کیسی بدات و مەحوییکاتەوە، لەبەرئەوە وەک باوکێکی خۆرهەڵاتی سزای دەدات، بەوەی ژنی بۆدەهێنێت. واتە شتێکی بۆدروستدەکات ئادەم دەبەستێتەوە و تا قیامەت دەبێت لەو ئازارەدا بژی کە بە هۆی حەواوە ناتوانێت بە ئازادی بێت و بچێت و بجوڵێت.

جەمشید بەوە کۆتایی بە چیرۆکەکەی هێنا و گووتی «شتێک نییە ناوی دۆزەخ بێت، ژنان دۆزەخی ئێمەن... وەک چۆن تا ئەبەدیش پیاوان دۆزەخی ژنن و هەرواش دەمێننەوە».

لە ڕاستیدا مامە جەمشیدم چیرۆکی ئادەم و حەوای بەجۆرێک تێکدابوو، مرۆڤ بە ئاستەم دەیناسییەوە، بەڵام ئەمجارە بەراورد بە هەوڵی پێشووی، سەردەمێک دەیویست بیسەلمێنێت مرۆڤ لە توخمی باڵندەیە، باشتر بیریکردبووەوە. من بێئەوەی زۆر تێبفکرم دەمزانی ئەم جۆرە تەفسیرەی بۆ چیرۆکی خەلیقەت، دەرەنجامی ئەو دۆخەی خۆیەتی کە هەردەم لە نێوان باوەشی خانمانی ئەستەمبول و خواستی سەفەردا جۆلانێیدەکرد و گینگڵی دەدا. هەندێک شەو کە دەچووین بۆ ماڵی مەنسورە هانیم یاخود کوچیک هانم بە خەفەتێکەوە دەیگووت «تاکە شتێک دەتوانێت من بە زەوییەوە ببەستێتەوە، لەشی ئەم کچە تورکە ناسکانەیە». بەڵام تادەهات پول و پارەمان بەرەو کزی دەچوو و دەبایە ئیشبکەین تا جەمشید خان بتوانێت شەوە ڕەنگاوڕەنگەکانی خۆی درێژە پێبدات.

گرووپی یەکەم کە دەبایە بیانپەڕێنینەوە لە شەست کەس زیاتر بوون، من دەفتەرداری جەمشید بووم، ناوەکان و بڕی پارە دراوەکانم دەنوسی و شوێنی نەفەرەکانم دیاریدەکرد. لەسەروو سەد هەزار دۆلارمان لە گرووپی یەکەم کۆکردەوە، ئیدی شوێنی نیشتەجێبوونی خۆمان گۆڕی و لە ئەپارتمانێکی ناسک و پاک و تەمیزدا کە دەکەوتە نێوان تەقسیم و تاشقیشلەوە نهۆمێکی گەورەمان گرت. پارەکە بەشی کڕینی ماشێنێکی گەورەی داخراوی باری کرد، کە هەڵبەت قەرەبیبەر خۆی بۆی کڕیین و بڕێکی زۆریشمان بۆ مایەوە. لە بازاڕی ئەستەمبولدا چیمان بۆ سەفەر پێویست بوو لە پەت و جلوبەرگ و لایتی دەست

ئامادەمانکرد و هەر قەرەبیبەر خۆشی دوو دووربینی شەوبینی تازەی لە ئەفسەرێکی تورک بۆ کڕینەوە، کە بەبێ ئەو دووربینانە کاری پلانەکەمان مەحاڵ بوو.

شەوێکی هاوین بە هەموو نەفەرەکانمانەوە بەرەو سنوور کەوتینە ڕێ، پەتی تەواومان کڕیبوو، ڕێنمایی تەواومان دابوو بە نەفەرەکان. لەسەر سنووری یۆنان دابەزین و لە شاخ و جەنگەڵستانێکی گەورەدا، لە خاڵێکەوە کە زۆر دوور نەبوو لە سنووری بولگارستان دابەزین. لەسەر سنوور هەموو نەفەرەکان لە ترسا دەلەرزین و منیش دەلەرزیم. بەڵام جەمشید خان کە جوڵەی بای زۆر بەدڵ بوو بە هەمووماني گووت دەبێت ترسمان نەبێت، چونکە ئەمە مسۆگەرترین سەفەرێکە لە ژیانماندا کردبێتمان. جەمشید وای گووت و لە ماشێنەکە پەتمان دەرهێنا و خان بەبەرچاوی نەفەرەکانەوە کە زاریان لەسەرسامیدا داچەقیبوو سەرکەوت بۆ ئاسمان. نەخشەکە وەهابوو کە من لە بەرزاییەکی دیاریکراوەوە جەمشید ڕابگرم و هێدی هێدی بڕۆم. جەمشید لەسەرەوە بە دووربینە شەوانەکەی دوورونزیک هەموو ڕێگاکانی دەبینی و هەر کەس لەسەر زەوی بجوڵابایەتەوە لە بەرچاوی ون نەدەبوو. پلانێکی بێوێنەبوو، تەنیا شتێک کە ڕێگای لێدەگرت ئەوەبوو ئاسان نەبوو، من هەم بە ڕێگادا بڕۆم و هەم پەتەکەی جەمشید لە هەوادا بگرم. جگە لەوە سەرەتا کۆنترۆڵکردنی پەتەکە بە جۆرێک لە دارودرەخت نەگیرێت سەخت بوو، بەڵام سەعات دوای سەعات و بەپێی ڕێنماییەکانی جەمشید کە لەسەرەوە دەیدامێ لێزانتر و شارەزاتر دەبووم. من و جەمشید بۆئەوەی هەمیشە قسەنەکەین زمانێکی نهێنی ئاماژەمان پەرەپێدابوو کە هەموو فەرمانە پێویست و گرنگەکانی لە خۆدەگرت. ژمارەیەک مورووو و ئەڵقەمان هەبوو کە هەر

یەکەیان هەڵگری مانایەکی تایبەتی بوون، جەمشید لە کاتی پێویستدا گەر نەیتوانیبایە بە جوڵەی ڕایەڵەکە و شێوەی ڕاوەشاندنیدا من تێبگەیەنێت، مورووەکانی دەناردە خوارێ و من لە هەموو شتێک تێدەگەیشتم و فەرمانی پێویستم بە گروپەکە دەدا. من بۆ کۆنترۆڵکردنی گروپەکە و تا بتوانم ئاسان بیانجوڵێنم، دەنگێکی بەرز و کاراکتەرێکی فەرماندارم لە خۆمدا دروستکردبوو کە بەهۆیەوە لە کاتی پێویستدا هەموانم دەوەستان و دەمخستنەوە جوڵە. شەوی یەکەممان سەختترین شەو بوو، بەڵام بە ئاسانی خۆمان لە ژەندرمی سەر سنوور و پۆلیسە گریکییەکان لادا. ئەو شەوە بە قووڵایی چل کیلۆمەتر چووینە زەوی گریکستانەوە و بە ئاڕاستەی بەحر ڕووە و شارە گەورەکان دابەزین. نەخشەکەمان وابوو کە بە ڕۆژ بخەوین و بە شەو بڕۆین، دەشبوو لە هیچ یەک لە ئەلکسەندرۆپولیس و کۆمۆتینی کە دوو گەورەترین شاری نزیک بوون لە ئێمەوە نەوەستین و بە خۆرئاوای ئێکسانتیدا ڕووە و کافالا بڕۆین، چونکە لەو شارانە پۆلیسی یۆنانی چاوەدێرییەکی توندی دەکرد و لە هەموو غەریبەیەکی دەپرسییەوە. بەگشتی چۆڵترین و بێترسترین ڕێگامان دەگرت، ئەو دەمانەی ڕۆژ نەبێت کە خانی باڵداری تیا دەخەوت، بەگشتی ترسمان نەبوو. لەو کاتانەدا هەوڵمدەدا هەموو گروپەکە بخەون و کەس خۆی دەرنەخات. خان ڕۆژ دوای ڕۆژ شوێنی قایمتر و حەشاری چاکتری دەدۆزییەوە. بە چەشنێک هەر لە سەرەتاوە هەموان تێگەیشتن گەر بەقسەی ئەو بکەین ئاسان دەگەینە ئەسینا.

بەسەرکەوتنێکی بێوێنەوە یەکەمین گروپمان لە تورکیاوە بردە ناو یۆنان... بەوە جەمشید وەک قاچاغچییەکی باڵدار ناوی

دەرکرد و بازاڕمان کەوتە گەورەبوونێکی وەهاوە لە وێزەی نەدەهاتین.

دوای دە ڕۆژ لە یەکەم گەشت من و خان دووبارە گەڕاینەوە بۆ ئەستەمبول، لە گەشتی گەڕانەوەدا زۆر جێگای ئاسانتر و ڕێگای سەلامەتترمان دۆزییەوە. لە ئەستەمبول لە کاتی کۆکردنەوەی گروپی دووهەمدا بەجۆرێک دەوڵەمەندبووبووین نەماندەزانی چی لە پارەبکەین، خان بە شەو کچە گەنجەکانی کوچیک هانیم یان مەنسورە هانیمی لە لیرەی تورکی هەڵدەکێشا و بەجۆرێکی ئەوتۆ کەیف و ڕابواردنی دەکرد من لە تەندروستی دەترسام. بەڵام ئەو دۆخە زیاد لە ساڵێک بەردەوام بوو. زۆرجار من و خان تا ئەسیناش دەچووین، خان لەوێش جگە لەوەی خەیاڵی لای ئافرەت و ژیانی خۆشگوزەران و کەیفکردن تا مردن بوو، بیری لە هیچی تر نەدەکردەوە. ئەو ساڵە من و جەمشید خان پتر لە سی و سێ گروپی گەورەمان ڕەوانەی گریکستان کرد، بێئەوەی تورکەکان و یۆنانییەکان پێمان بزانن یان کەسێکمان هەڵەبێت و بگیرێت. خانی باڵدار بەردەوام لەسەرەوە پاسەوانێتی دەکردین، بە دڵسۆزییەکی گەورەوە هەموو هەڵهاتووەکانی دەپاراست، بەردەوام هەموو جۆرە دەرمانێکی بۆ سەفەرەکان ئامادەدەکرد، بایەخێکی بێوێنەی بە ژن و منداڵ دەدا، گەر ئافرەتمان زۆر لەگەڵ بایە وریاتر و لەسەرەخۆتر دەڕۆیشتین. گەرچی ئەو لە باڕ و خانەکانی لەشفرۆشیدا پیاوێکی شەهوەتبازبوو، دەیخواردەوە، دەستیدەبرد، شەڕیدەکرد. بەڵام لەناو گروپەکاندا بە حورمەتەوە مامەڵەی لەگەڵ ژناندا دەکرد. بە گشتی ئەخلاقێکی بەرزی کارکردنی هەبوو کە هێندەی تر ناووناوبانگی گەورەکردبوو. گەر یەکێک ونبایە یان ماندووبایە هەموومانی ناچاری وەستان دەکرد، هیچ کەسێکی تەنیا لەو کێوانە بەرەڵا

نەدەکرد، جاری وابوو بە ڕۆژیش دەچووە ئاسمان تا کەسێکی ون و ڕێ ونکەر بدۆزێتەوە. هەر کەسێک تێکەڵ بە گروپەکانی ئێمەبایە کۆمەڵێک ڕێنمایی نوسراوی وەردەگرت کە دەبوو هەمووی ڕەچاوبکات. ئەوە ناوبانگی جەمشید خانی لەناو هەڵهاتووە ئەفغانی و پاکستانی و سریلانکیکانیشدا بەرزکردبووەوە، کە جەمشید بەهەمان حورمەت و ئەمانەتەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن. باوەڕی وابوو لەو ڕێگایەدا هیچ جیاوازییەک لە نێوان مرۆڤەکاندا نامێنێت، هەژار و دەوڵەمەند، شوناس و نەتەوە، ڕەگەز و دین هەموو لە کاردەکەون و ئەوەی دەمێنێتەوە، پەیوەندی نێوان کۆمەڵێک مرۆڤی بەدبەختە کە هەموو پێکڕا بەرەو نادیار هەڵدێن. هەندێجار کە مەستدەبوو زیادەڕەوی لە نرخی کارەکەی خۆیدا دەکرد و خۆی وەک پێغەمبەرێک دەبینی کە نەتەوەیەکی نوێ لە زەوییەکەوە بۆ زەوییەکی دی و لە زەمانێکەوە بۆ زەمانێکی دی دەگوازێتەوە. هەموو جارێک دەیگووت «پەناهەندەکان نەتەوەیەکی تازەن لەسەر زەوی». ئەوەی من سەرەنجمدەدا ئەو شەیدابوونە گەورەیەی بوو بە دەریا، زۆرجار کە لە دەریا نزیک دەبووینە سێ مورووی چوارگۆشەی دەنارده خوارێ کە مانای ئەوە بوو زیاتر بەرزیبکەمەوە و لێگەڕێم لەسەرەوە سەیری ئاوبکات و هەوای پاکی بەحر هەڵمژێت. زۆر لەزەتی لەوە دەبینی پێش کازیوە، دەمی تاریک و ڕوون لەسەرەوەڕا تەماشای کەشتییە خەواڵووەکان بکات و لە باڵاوە بە دووربین ڕاوکەرانی گوێ ئاو و ماسیگرە یۆنانییەکان ببینێت.

جارێک سامانەکەمان بەرەو سەرووتر لە ملیۆن دۆلار سەرکەوت، جەمشید هەمیشە برێک پارەی زۆری لە نایلۆنەوە دەپێچاو و لە کۆڵەپشتە ڕەشەکەیدا هەڵیدەگرت، من ئەوکات نەمدەزانی چۆن

هەموو ئەو پارانە هەڵگرین و بیپارێزین، ڕۆژێک لە ژێر بەردێکی گەورەی کەناری مەڕمەڕەدا پتر لە سێ سەد هەزار دۆلارم کردە جانتایەکەوە و تا ڕۆژی ڕەش شاردمەوە، بێئەوەی شوێنەکەی لای خان ئاشکرابکەم کە دەترسام بیبات و لە کاتی سەمادا بەسەر کچەکانی مەنسورە خان یان لە ماڵی مارال هانیمدا تەخشان و پەخشانی بکات. من لەو ساڵەدا فێربووبووم، چۆن منداڵێک کۆلارەیەک بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت، بڕۆم و پەتەکەی جەمشید خان بەردەوام بەدەستمەوە بێت، بەوەدا سەلامەتی هەموو گروپەکە لەسەر من وەستابوو، لە هەمووان کەمتر دەخەوتم و لەوانی دی کەمتر پشوومدەدا، هەتا جەمشید خان کاتێک بیزانیبایە مەترسی دوورە و هیچ شتێک لە دەورمان نییە لە ئاسماندا لێیدەخەوت، بەڵام من هەمیشە بێداربووم، ئیدی بێخەوی دووروودرێژ چاوی لاوازکردم و تادەهات بینینم خراپتر دەبوو. ڕۆژێکیان زۆر لە جەمشید خان پاڕامەوە وازبهێنین و بڕۆین بۆ ئەورووپا و لە دەست ماندوویێتی بەردەوامی ئەم ژیانە پشوو‌بدەین. بەڵام جەمشید خان دەیگووت لە ماوەی ساڵێکی دیکەدا دەتوانین بەشی ئەوەی تا مردن ئیش نەکەین پارە بەیەکەوە بنێین، ئیدی بۆ بوەستین. بەڵام من ڕۆیشتنی بەردەوام قاچ و قوولی وێرانکردبووم، دڵنیاشبووم جارێک پێشهاتێک دێتەپێشێ بەری بە ئێمە ناگیرێت و بەجۆرێک لە جۆرەکان هەموو شتێکمان لە کیس دەچێت.

دوای ساڵێک لەکارکردن، دەمێک ئێمە گروپێکی گەورەمان تا ئەسینا گەیاندبوو، لە نزیکی ئەزمیر، قەرەبیبەری دۆست و هاوڕێمان بەدەستی یەک دوو قاچاغچی گەورەی تورک کوژرا. هەواڵی کوشتنی قەرەبیبەر بۆ ئێمە کاریگەر بوو، چونکە تاکە کەسێک بوو دەیتوانی هەموو کاروباری پۆلیسی تورکیمان بۆ

جێبەجێبکات. نەمانی قەرەبیبەر مانای لەدەستدانی هەر پشت و پەنایەک بوو. من دەمزانی ژمارەیەک لە قاچاغچییە کوردەکان چاوەڕوانی دەرفەتێکی وەهان تا خۆیان بازاڕ بگرنە دەست و ئێمە بخەنەلاوە. من بە جەمشیدم گووت کە چیتر نەگەڕێینەوە بۆ تورکیا و لێرەوە بەرەو ئیتالیا بڕۆین، بەڵام جەمشید سووربوو لەسەر ئەوەی خواحافیزی لە کچەکانی مەنسورە هانیم وماڵەکانی دی بکات و بۆ دواجار لەگەڵ هەندێکیاندا بخەوێت، گووتی «ئەوە دواهەمین یادگاری خۆشی ژیانم دەبێت... تێدەگەیت، گەر وانەبێت لە هەر شوێنێکی دونیابم شەوقی یادگاری ئەوان دەمکوژێت... من پێم نەگووتی پیاو یەک جەهەنەمی هەیە، ئەویش ژنە».

کاریگەرییەکانی کوشتنی قەرەبیبەر لەسەر بازاڕی قاچاغچێتی بەچەشنێک گەورەبوو، شەپۆلەکانی هەر زوو گەیشتنە سەر ئێمە. باندی قاچاغچییە کوردەکان پێشتر لە ترسی قەرەبیبەر نەیاندەوێرا گرفتمان بۆدروستبکەن، بە نەمانی ئەو دەمودەست هەموو ڕێگاکانی هاتوچۆکردنی ئێمەیان بۆ پۆلیس ئاشکراکرد و خۆیان شوێنی ئێمەیان گرتەوە. لەدوا سەفەرماندا زۆرنەبوو کە لە سنووری گریکەکانەوە هاتین و پێمان خستە سەر زەمینی تورکان، تووشی بۆسەیەکی مەحکەمی ژەندرم بووین. ڕۆژێکی بادار بوو، لە چیاوە با بەرەو دەریا تەکان و گوژمی دەدا، جەمشید خان هێشتا بە ئاسمانەوە بوو کە چواردەوریان گرتین، بۆسەکەیان وەها دانابوو خان لە باکووروەوەڕا ئاسان نەیدۆزێتەوە، پێدەچوو وابزانن تاقمێکی زۆرین و لەوە خەبەردارنەبن کە تەنیا من و خانی باڵدارین لەم ڕێگایەوە دەگەڕێینەوە. بە کۆمەکی وەرگێڕێکی کورد بانگیان لە ئێمەکرد کە چواردەورمان گیراوە و باشترە خۆمان بدەین بەدەستەوە.

خواستێکم نەمابێت بەدوایدا بگەڕێم، رەنگە بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە لە نەستی خۆمدا ئەو ئومێدەم دروستکردبێت و بە ئاواتم خواستبێت کە بمرێت، ڕەنگە ئەوە تەنیا شێوە تۆڵەی من بووبێت لە خان کە نیوەی ژیانمم وەک رایەڵگری ئەو، وەک کۆیلەی ئەو لە بەر سەرما و لە زوڵمەتی تاریکیدا بردبووە سەر. هەموو خەڵک باوەڕیان بە چیرۆکەکەی من کرد خۆم نەبێت. هەواڵی خنکانی جەمشید خان لە هەموو جێگایەکدا بڵاوبووەوە، کیژەکانی مەنسورە هانیم پرسەیان بۆ دانا و هەندێک لەوانەی منیان دەناسی کە لە ڕێگا دەیانبینیم سەرەخۆشیان لێدەکردم. من لەو ماوەیەدا شەوێکی ئەنگوستەچاو گەڕامەوە و ئەو سێ سەد هەزار دۆلارەی لە بن بەردێکی کەناری مەرمەڕەدا شاردبوومەوە هەڵمگرت و بە تاکسییەکی نەفەربەر هاتم بۆ سلۆپی، لەوێشەوە بە هەموو کەژوکێوی سنووردا، بەتەنیا و بە کۆڵەپشتێکی گەورەوە گەڕامەوە بۆ ماڵ.

جەمشید خان دە ساڵی ڕێکی ویست تا بگاتەوە نیشتیمان، من دە ساڵی ڕێک چاوەڕوانی ئەوبووم و دڵنیابووم جارێکی دی دەگەڕێتەوە.

ئەو شەوە کە ژەندرمەکان گەمارۆیان داین و خان لە هەوادا بەربوو، با چەندین ڕۆژ هەر بە ئاسماندا دەیبات و دایدەنێت، بەسەر هەموو یۆناندا دەیگێڕێت، بەرەو دوور دەیبات و دەیهێنێتەوە، بەرەو دەریا دەیرفێنێت و دەیخاتەوە سەر خاک، ئەو لە هەوادا دەبوورێتەوە و دێتەوە هۆش خۆی، دەخەوێت و هەڵدەستێت، خۆر دەبینێت هەڵدێت و خۆر دەبینێت ئاوا دەبێت، کەشتییە گەورەکان دەبینێت تێدەپەڕن و کەشتییە بچوکەکان دەبینێت ڕاودەکەن... هەمیشەش با دەیبات و بادەیبات، لە ئاسمانەوە ڕۆخە دوورەکانی باکووری ئەفریقا دەبینێت،

وەردەگەڕێ و دێتەوە بۆ باکوور و لەنگەرێک نادۆزێتەوە. دوای شەوان و ڕۆژانێکی زۆر، کە نەکەس ژماردونی و نەبەکەسیش دەژمێردرێن، شەوێک لەناکاو هەوا دەگاتە وادەی پشووی خۆی و خان لە ئاسمانەوە بۆ ناوەڕاستی دەریا بەردەبێتەوە... بەڵام جەمشید لەو بەختەوەرانەیە کە ژێر ئاو ناکەوێت، وەک پەڕە کاغەزێک دەکەوێتە سەر دەریا و ناخنکێت. ئەوەی ئێستا دەیزانین ئەوەیە کە دوو ماسیگری ئیتالی لە دەریادا دەیدۆزنەوە. وەک هەمیشە جەمشید خان لە کەوتنە خوارەوەیدا ڕابوردووی خۆی بیردەچێتەوە، کە ماسیگرەکان هەڵیدەگرن نازانێت چی هێناویتییە ناو ئەم دەریا گەورەیە، ئەوەی لە بیرە کە کوردە، کە دەتوانێت بفرێت، کە پارەیەکی زۆر لە جانتاکەیدایە، بەڵام نازانێت کێیە و لە کوێوە هاتووە و بۆ کەوتۆتە ناوەڕاستی ئەم دەریایەوە. لە ماسیگرەکان داوادەکات پەتی لێببەستن و بەرەو ئاسمان هەڵیدەن بۆئەوەی با بیگێڕیتەوە بۆ نیشتیمان. جەمشید دەساڵ لەو بازنەیەدا دەژی، پەتی لێدەبەستن، دەچێتە کەشکەشانی فەلەک و لەوێوە خۆی بەرەڵادەکات، با دەیبات و دەیهێنێتەوە، لە ناکاویش لە ساتێکی خامۆشی و خەوتنی هەوادا دووبارە لە ئاسمان بەردەبێتەوە. هەرجارێکیش کە دەکەوێتە خوارێ لە سەر زەمینێک و لە جێگایەکەوە سەردەردەهێنێت، جارێک لە مالتا، جارێک لە قوبرس، جاریک لە کریتیا، جارێک لە ڕۆخەکانی ئەلبانیا، جارێک لە سنووری بەلکان ... بەوشێوەیە ناو هەموو نەتەوەکان دەگەڕێت، چەندەها جار یادەوەری خۆی لەدەستدەدات، ماوەی درێژ لە شارانی دووردا دەمێنێتەوە، هەرجارەی زمانی نەتەوەیەک فێردەبێت، بەڵام هەر دەچێتە ئاسمان و لەوێوە دەکەوێتە خوارەوە ئەوانەی یاددەچێتەوە کە فێریبووە و لە شوێنی ترەوە سەردەردەهێنێت و دەبێت زمانی تازە فێربببێت.

هەموو جارێک دوای ماوەیەک ژیان لە جێگایەکدا، خولیای فڕین دەکەوێتەوە سەری و دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ نیشتیمان، بەڵام پیاوێک نە شوناسی هەیە، نە پاسپۆرتی هەیە، نە هێزی هەیە، نە هاوڕێ و هاودەمی هەیە، جگە لەوەی ڕۆژانی با بچێتە سەر شوێنی بەرز و خۆی بداتە دەست گەرداو ڕێگای تری نییە. باش هەندێجار دەیبات بۆ دەریا و هەندێجار دەیهێنێتەوە بۆ سەر زەوی، هیچ کات گەردەلوولێکی وەها شێتی تووش نایەت تا نیشتیمان هەڵیبگرێت... بەوەدا جەمشید چەندین جار لەسەر یەک یادەوەری سڕدراوەتەوە و لەسەرەتاوە دەستی پێکردۆتەوە، ئێستا نازانێت لەو دەساڵەدا چۆن ژیاوە و لە کوێ ژیاوە و چی کردوە و پارەکانی چییان بەسەر هاتووە.

دواجار نیوەڕۆیەکی گەرمی هاوین، ئاسمان لە باکووری «لاڤاریۆن» لە هەرێمی «ئەتیکا» فڕێیدەدات و پیکابێکی میوەبەر کە بەرەو ئەسینا دەگەڕێتەوە لەگەڵ خۆیدا هەڵیدەگرێت و دەیبات بۆ بیمارستان. «پیاوێکی تەنک وەک پەڕی سیگار» وەک خۆی دواتر لە یاداشتەکانیدا دەنوسێت، یان زیادەڕەویدەکات و دەڵێت «پیاوێک وەک سیلیڤۆنێکی شەفاف کە بەجۆرێک ئاوی و ڕوونە شتەکان لەو دیوییەوە دیارن» ... بەڵام پیر، ماندوو، بێیادەوەری و بێ هیچ شتێک... مەخلوقێک مەحکومە بەوەی هەموو جارێک لە سەرەتاوە دروستببێتەوە.

لە بیمارستان ئەو کیژە تیمارچییەی سەرپەرشتیدەکات، ئەوەی لێتێدەگات کە کوردە. ئەوە تاکە شتێکە هەرگیز لە یادەوەری جەمشید خان ناسڕدرێتەوە. کیژەکە لە ماڵێکدا نیشتەجێیە کە لەسەرییەوە دوو کرێکاری کورد دەژین. ئێوارەیەک بە ماشێنەکەی خۆی هەردووکیان دەهێنێت بۆئەوەی قسە لەگەڵ ئەم پیاوەدا بکەن کە کەس لە بیمارستان لە زمانی تێناگات.

هەردوو کوڕەکە دەمودەست جەمشید خان دەناسنەوە، ئەو قاچاغچییە باڵدارەی کە وا بڵاوە لە دەریادا خنکابێت. دوو گەنجەکە کە خۆیان گەلێک بەقەرزاریاری خان دەزانن، یادێک و هەستێکی پاکیان بەرامبەری هەیە، هێندەی وای لێدێت لە بیمارستان ئازادبێت، دەیبەنە ماڵی خۆیان و بڕیاردەدەن هەموو کۆمەکێکی پێبکەن.

کەس بەدروستی نازانێت کێ ئەو بیرۆکەیەی بۆهات کە خان لە تابووتێکدا بنێرنەوە بۆ نیشتیمان. بەڵام پێدەچێت جگە لەو ڕێگایە، ڕێگایەکی تر نەبووبێت ئەم مەخلوقەی پێ ڕزگاربکەن، پیاوێک کە نەزەوی بەخۆی دەگرێت، نە ئاسمان، نەدەریا. دوو کوڕەکە بە هاوڕێیەکی خۆیاندا کە بەردەوام لە خۆرئاواوە ماشێنی گرانبەها دەباتەوە بۆ کوردستان، جەمشید ڕەوانە دەکەنەوە. کفنی لەبەردەکەن و دەیخەنە ناو تابوتێک و بە هەموو گریکستان و تورکیادا دەینێرنەوە بۆ نیشتیمان. لە خاڵەکانی پشکنین کە سەری تابووتەکە هەڵدەدەنەوە، لە دیمەنی عاجباتی ئەم مەخلوقە تەنک و بێجورمە سەریان دەسوڕمێت کە وەک مردوو چاوی لێکناوە و جوڵەی لێوەنایەت. جەمشید خان تا ناو شار لە تابووتێکدا دەگەڕێتەوە. لەو ڕێگا درێژەدا تەنیا شتێک لە ژیانی ڕابوردووی بیریدەکەوێتەوە، ناوی خۆی و باوکی و ئەدیب خانی برایەتی. کە دەگەنە شار، جەمشید لە بەردەرگای ماڵی ئەو کوڕەدا لە تابووتەکەی دادەبەزێت و هەفتەیەک میوانی ئەو گەنجە دەبێت کە گەلێک دڵسۆزانە دڵی ڕادەگرێت و خزمەتیدەکات، دواجاریش بە هەوڵی خۆی و خێزانەکەی ماڵی ئەدیب خانی مامم دەدۆزنەوە و دوای ئەو هەموو ساڵە هەواڵی هاتنەوەی جەمشیدیان پێدەدەن.

هەواڵەکە بۆ ئەوانی دی وەک بروسکە وەهابوو، چونکە ئەو هەموو ساڵە پێکڕا باوەڕیان بەو چیرۆکەی من کردبوو، کە جەمشید لە دەریادا خنکاوە.

## ئاژانسەکەی جەمشید خان

دوای دەساڵ بینیمەوە، لە سەر کورسییەکی گەورە دانیشتبوو و بەتانییەکی لە خۆیەوە پێچابوو و چپسی دەخوارد و سەیری سریالێکی منداڵانەی دەکرد و پێدەکەنی. کە منی بینی هاواریکرد «تۆ دەناسم، تۆ دەناسم، تۆ ئەوەیت کە لە بارانۆک پێکەوە قاچکمان دەخوارد». من چوومە بەردەمی و چۆکم دادا و دەستیمگرت و بەدڵێکی پڕەوە پێمگووت «ئاه... مامە گیان... ئاه ... مامە گیان». زۆر پیربووبوو، زۆربەی سەری سپی بووبوو، هەوا و سوێراوی بەحر دەموچاویان داغانکردبوو، چاوانی لە جاران بچکۆلەتر و لە ڕوخساریدا ئازارێکی نهێنی هەبوو کە پێشتر نەمدیبوو. تا چەند هەفتەیەک جگە لەوەی کە دەیگووت تۆ ئەوەیت لە بارانۆک پێکەوە قاچاکمان خواردووە هیچی دی نەدەگووت... جگە لەوە هیچی لەو ژیانە دوورودرێژە بیر نەمابوو کە پێکەوە بردومانەتەسەر. وەک هەمووجارێک بەدەستی خۆم هەڵمگرت و بەپلەکەکاندا سەرکەوتم و بردمەوە بۆ ژوورەکەی خۆی لە قاتی سەرەوە، لەو ساتەدا کە بەپلەکاکاندا سەرمدەخست بۆیەکەمجار لە ژیانمدا هەستمکرد کە منیش پیربووم... زۆر پیربووم.

ئەو دەساڵەی لە جەمشید خان دووربووم، لە ژوورەکەی ئەودا بردمەسەر. باپیرم و داپیرەم ژوورەکەی ئەویان دامێ و منیش بێئەوەی دەستکاری هیچ شتێک بکەم تیاژیام. زۆربەی کاتەکان بە تەنهابووم. سمایل ئەوکات لە ڕۆژنامەیەکی ئەهلی کاریدەکرد، بەچەند مانگێک جارێک شەوێک دەهات بۆلام و چەند سەعاتێک دادەنیشت. بە گشتی دۆخێکم هەبوو لای هەمووان شایستەی بەزەیی بوو. ڕۆژانە دوو سەعات دەچوومەدەرێ، لە چایخانەیەکدا چایەکم دەخواردەوە و دەگەڕامەوە بۆ ماڵێ، زۆربەی کات تەنها سەیری ئاسمانم دەکرد و هیچی تر... لەبەر باڵکۆنەکەدا کورسییەکم دادەنا و سەیری هەور و ئەستێرەم دەکرد و چاوەڕوانی ئەوەبووم ڕۆژێک جەمشید لە هەوادا ببینم، جگە لە چا و جگەرەی بەردەوام هیچی ترم نەبوو. چەند جارێک دەستم بە نوسینی کتێبێک لەسەر ژیانی ئەو کرد، بەڵام بۆم نەدەهاتە حیساب. زۆرجار بۆ پیاسەکردن و هەوا گۆڕین دەچوومەوە بۆ بەرزاییەکانی بارانۆک، لەوێ بە هەفتە لە ناو سروشتدا پیاسەمدەکرد، چەندین شەو بە ناو درەختەکان و لە کێوەکاندا دەگەڕام، ئەو پیاسانەی شەو یارمەتیاندام زۆر لە خەیاڵاتی ڕەش لەسەرم دەربکەم. زۆر شەو دەچوومە جێگا هەرە بەرزەکانی بارانۆک و لەوێوە حەزمدەکرد بفڕم، دەمویست یەکجار ئەو جۆرە ژیانە بژیم کە جەمشید خان تیادەژیا، شتەکان هەمووی لە بەرزاییەوە ببینم، بەرزاییەک کە جۆرێک لە غرور و بێباکی بەخشیبوو بەو کە من نەمبوو. بیری ئەو پەت و ڕایەڵانەم دەکرد کە مامم پێ بەرزدەکردەوە، هەستمدەکرد بە ونبوونی خان، منیش ونبووم، بە خنکانی ئەو لەدەریادا منیش لەناو پوچی ژیان و ساردی شتە سادە و ڕۆژانەکاندا خنکاوم. ئەو ڕایەڵانە تەنیا هۆکاری من بوون بۆ خۆبەستنەوە بە ئاسمان و بە گەردوون و بە شتە دوورەکانەوە. لەو دەساڵەدا چەند جارێک بیرم لە

ژنهێنان کردەوە و پەشیمان بوومەوە، چەندجارێک بیرم لە ئیشکردن کردەوە و پەشیمان بوومەوە، تەنیا بەو پارەیە دەژیام کە لە تورکیاوە لەگەڵ خۆمدا هەڵمگرت، بەڵام ژیانم وەک ژیانی زاهیدێک بوو، زۆر کەمم دەخوارد، زۆر کەم جلی نوێم دەکڕی، جگە لە جگەرە و چا شتێکی گرنگ لە ژیانمدا نەبوو. لەو ساڵانەدا هەریەک لە حیسام خان و نەنە پیرۆز کۆچی دواییانکرد و من بە تەنیا لەماڵەکەدا مامەوە کە هەمووان لەسەر ئەوە تەبابوون کە هەرگیز نەفرۆشرێت و وەک یادگارێکی کۆنی باوان بۆ نەوەکانی داهاتوو هەڵبگیرێت. من سوودێکی زۆرم لەو بڕیارە بینی و بە تەنیا لەو خانووە گەورەیەدا مامەوە کە دوای مردنی باپیران یان کپییەکی کوشندە یا دەنگی با لە ناوەوە دەیخنکاند. لەو دەساڵەدا من نەمتوانی هیچ بکەم، چونکە لە نیهانی خۆمدا چاوەڕوانی گەڕانەوەی جەمشیدم دەکرد، نەمتوانی ژن بهێنم، چونکە لە نیهانی خۆمدا دەمگووت گەر ببمە خاوەنی خێزان و خانی لاواز بگەڕێتەوە، کێ پاسەوانی دەکات و دەبێتە ڕایەڵگری، گەر کار بدۆزمەوە چۆن دەتوانم ئاگام لە جەمشید خان بێت. بەکورتی جەمشید خان هەمیشە بەهانەی گەورەی من بووە بۆئەوەی نەژیم و خۆم لە سەیرکردنی بۆشی و بەتاڵی ئاسماندا نوقمبکەم، بێئەوەی ئاسمان وەڵاممبداتەوە و هیچم بداتێ. بەڵام جەمشید خان... جەمشید خان، تەنیا یەک شتی لەبیربوو ئەویش ئەوەیە لە بارانۆک پێکەوە قاچکمان خواردوە... ئەوە تەنیا شتێک بوو کە دەیگووت و دەیگووتەوە.

چەند مانگێکی ویست تا خان بڕێک لە یادەوەری گشتی خۆی بەدەستهێنایەوە، لەو ماوەیەدا هێدی هێدی بە ژوورەکەی خۆی ڕاهاتەوە و یەکەم شت کردی ئەوەبوو وەک سەردەمی گەنجی منی ئاگادارکردەوە کە چیتر بۆم نییە پێبخەمە ناوی. ئەو

بڕیارەم پێخۆش بوو، چونکە ئاماژەیەک بوو کە خان دەگەڕێتەوە دۆخی جارانی خۆی. ئەوەی بەلامەوە سەیربوو، ئەمجارە هەستێکی قووڵی هەبوو کە یادەوەری خۆی لەدەستداوە و بەراستی دەیویست مێژووی تایبەتی خۆی وەدەستبهێنێتەوە. دوای ئەوەی هێدی هێدی قۆناغی بیماری و ونبوونی تەواوی یادەوەری تێپەڕاند، ڕۆژێک لەگەڵ سمایلدا چوون بۆ کتێبخانەی گشتی و کۆمەڵێک کتێبی عەرەبی دەربارەی هونەری نوسینی ژیاننامە وەرگرت و کەوتە خوێندنەوەیان. گووتی کە دەیەوێت لەڕێگای نوسینەوە چاڵە تاریک و سیاکانی ناو یادەوەری خۆی پڕبکاتەوە. شەوێک لە منی پرسی تۆ لەو باوەڕەدایت من گەر ژیانی خۆم بنوسمەوە کتێبێک دەرچێت کەس بیخوێنێتەوە. قسەکەی سەرسامیکردم، چونکە لە ڕاستیدا جەمشید خان هیچی ئەوتۆی دەربارەی ژیانی خۆی بیرنەمابوو، هەتا ئەوەشی بیرچووبووەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان عێراق و ئێران لە جەنگێکی گەورەدا بوون و پێیوابوو لە گەنجیدا لە ترسی حیسام خانی باوکی ڕایکردوە بۆ بارانتۆک. کە وێنەی زەماوەندە گەورەکەی خۆی و سافینازم پیشاندا، گووتی وێنەی زۆر ئافرەت لە خەیاڵیدایە، بەڵام ئەم سافینازەی نەبینیوە کە پێدەچێت یەکێک بێت لە فێڵ و درۆ زۆر و زەبەندەکانی من. کە باسی ئەوەم بۆ کرد کە ویستوومە کتێبێک لەسەر ژیانی بنوسم، کەمێک تێڕاما و گووتی «هەموو مرۆڤێک لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی ژیانیدا خولیای نوسینی کتێبێک دەکەوێتە سەری، بەدەگمەن مرۆڤێک هەڵدەکەوێت لە ژیانیدا جارێک بیری لە نوسینی کتێبێک نەکردبێتەوە». جەمشید خان پێیوابوو دەتوانێت یادەوەری ئەو دەساڵەی دوایی کە تێیدا ونبووە بنوسێتەوە، ئەوە دڵی منی زۆر خۆشکرد، لای من ئەو ئارەزووەی خان نیشانەی بوێرییەکی زۆر و ئامادەگییەکی نهێنیی بوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خۆی. خان

بەدرێژایی ژیانی هەروابوو، هەمیشە لە نێوان ئەوپەڕی جورئەت و ئەوپەڕی ترسنۆکیدا جۆلانێیدەکرد. نزیکی دوو مانگ بە نهێنی خەریکی نوسین بوو، بەڵام هەرگیز باوەڕی بە خوێندەواری من نەبوو، لەو باوەڕەدا نەبوو من هەر بتوانم بەتەواوەتی بخوێنمەوە یان بنوسم. دوای مانگێک یاداشتەکانی خۆی لە فایلێکی سووردا دا بە سمایل... سمایل دوو ڕۆژ لەسەری دانیشت و دواتر بەدەرەنجامێکی زۆر نائومێدکەرەوە هاتەوە، خان لە سەفەرەکەیدا لەبری ئەوەی باسی گەشتی ڕاستەقینەی خۆی بکات، قسەی لەگەشتێک کردبوو کە تێیدا ئەو سەرداری کەشتییەکی گەورەبووە، دێوی گەورە هاتوونە بەردەمی، پەری ئاو فریویانداوە، کەوتۆتە دوورگەیەکەوە هەمووی خانمانی قەشەنگ بووە، لە جێگایەکدا بووە بە دیلی جانەوەرێکی گەورەی یەکچاو... سمایل ڕای وابوو کە جەمشید خان لە بری سەفەرە ڕاستەقینەکەی خۆی، چیرۆکی گەشتی ئۆدیسیۆسی بەتێکەڵی نوسیوەتەوە کە دەشێت لە جێگایەک لە جێگاکانی سەفەرەکەیدا خوێندبێتییەوە یان بەرگوێی کەوتبێت. ئەوە مایەی نائومێدییەکی گەورەی من بوو کە دەمویست زانیاری زۆرتر و وردتر دەربارەی ئەو دەساڵە نادیارەی ژیانی جەمشید خان کۆبکەمەوە. زۆری نەبرد ڕۆژێک جەمشید خان گووتی «نوسینی کتێب لەسەر خۆت گەورەترین بێمێشکییە، تەنیا خەڵکانی بێمێشک دەتوانن کتێب لەسەر خۆیان بنوسن، کتێب بۆ ئەوە کراوە مرۆڤ لە ڕێگایەوە خۆی لە بیربچێتەوە نەوەک بکەوێتە ناو چاڵە تاریک و داوە ئاڵۆزەکانی خودی خۆیەوە»... دوای ئەو ڕستەیە زۆری نەبرد، جەمشید خان هەموو ئەو دەستنوسانەی سووتان کە دەیویست لە ڕێگایانەوە ژیان و یادەوەری خۆی بدۆزێتەوە. شەوێکی ڕەشەبا پێکەوە لە داوەتێکی ماڵی مامە ئەدیبم دەهاتینەوە کە لە ناکاو بڕیاریدا چیتر بەدوای خۆیدا

نەگەڕێت و خۆی بۆ دۆزینەوەی نهێنی جیهان تەرخانبکات. لە ڕاستیدا من لەسەرەتاوە بە هیچ جۆرێک لەم زاراوەی «نهێنی جیهان» ـە تێنەگەیشتم، بەڵام تێپەڕینی کات زامن بوو، هێدی هێدی لە مانای ئەو گوزارە ئاڵۆز و پڕ تەلیسمەی ئەو تێبگەم.

خان تادەهات زیاتر و زیاتر لە سمایل نزیکدەبووەوە، هەر لەسەرەتای گەڕانەوەیەوە سەرسامییەکی زۆری بە سمایل هەبوو، ئەوەی کە لە ڕۆژنامەیەکدا کاردەکات لای خان وەک ئیشێکی باڵاو نمونەیی سەیردەکرا. من جارێک گووتم « لای ئێمە کەوچکێک لە نوسەری خراپ تێکەڵ بە کەوچکێک لە سیاسی خراپ بکە و جوان ڕایانوەشێنە و چەند کەوچکێک لە گیراوەی مەلای خراپیان تێکەڵاوبکە و تۆزێک لەگەڵ ئاودا بیانخەرە سەر ئاگر و بیانکوڵێنە، ئەوە ڕۆژنامەنوسی عەیارە بیستوچواری وڵاتی ئێمەی لێدەردەچێت». ئەوە جەمشیدی زۆر توڕەکرد و گووتی من بێشەرەفم و سووکایەتی بە ئیشێکی موقەدەس دەکەم. من بۆئەوەی پتر توڕەیبکەم گووتم «ئەو کورسییەی کە ئێمە لەسەری دادەنیشین و دارتاشێکی نەخوێندەوار دروستیکردوە، هونەری لە هەموو ئەو ڕۆژنامانە زیاتر تێدایە کە لەسەر کورسییەکە دەیخوێنینەوە». دیارە وێنەسازییەکەم زۆر باش نەبوو، بەڵام جەمشیدی بەشی ئەوە توڕەکرد بڵێت کە من جگە لە ئازاردانی ئەو و سەرسەختیکردن بەرامبەری کاری دیم نییە و ئەو قسانە نیشانەی نەخوێندەوارییەکەمە و ئەو دەساڵەی کە ئەو لێرە نەبووە، من بەتەنیا پتر لە نەزانیدا نوقمبووم و باشتر وایە بچم بۆ شوێنێک فێری سەرەتاکانی خوێندن و نوسینم بکەنەوە، چونکە من کاتی خۆی قوتابییەکی بێبەهرە و نەزان بووم و بەکەڵەکەبوونی ساڵان لەسەر یەک ئەو کەمە خوێندەوارییەی هەمبووە بیرمچۆتەوە و چاکترە لەسەرەتاوە

دەست پێبکەمەوە. لە ڕاستیدا خان لەو ڕووەوە کەمێک لەسەر هەق بوو، من گەرچی بەدەست و خەتێکی خراپ دەمویست کتێبێک لەسەر ئەو بنوسم، کەچی لە یادم نەبوو ڕۆژێک کتێبێکی ڕاستەقینەم لەمسەر بۆ ئەوسەر خوێندبێتەوە. خان دواجار بە ڕەقی پێیگووتم ئەوکاتە زۆرەی وەک خەڵەفاوێک لەسەیرکردنی ئاسماندا دەیبەمەسەر و مێش دەداتە دەموچاوم و جگەرەدەکێشم و چا دەخۆمەوە، چاکترە لە فێربوونی شتێکی باشدا سەرفیبکەم. من لەوجۆرە کاتانەدا کە خان بەتوندی دادەبەزییە سەرم، ڕێک بەرامبەری دەوەستام و بەدەموچاوێک کە هیچ جۆرە تەعبیرێکی دیاریکراوی لەسەر نەبوو بەردەوام سەیرمدەکرد، ئەوە شتێک بوو خانی زیاتر پەستدەکرد.

خان چەند ڕۆژێک لەسەر یەک چوو بۆ لای سمایل لە بنکەی ڕۆژنامەکەیان، دەیگووت لەوێ بەتەواوەتی هەستدەکات دونیا چەند گۆڕدراوە و خۆری چ دەور و زەمانێکی تازە هەڵهاتووە. بەوەدا حورمەتێکی زۆری بۆ ڕۆژنامەوانی هەبوو، نەیدەهێشت من بچمە ژوورێ بۆ ناو بیرۆکان و دەیگووت «دەترسم تۆ بێعەقڵییەکی گەورە بنوێنیت و کارێکبکەیت ناومان بە خراپی بچێتە جەریدەکەوە». ئیدی هەموو جار سمایل خۆی تا ناوەوە یاوەریدەکرد.

پێدەچوو ئیشی ڕۆژنامەکە مامی زۆر سەرسامکردبێت، پاش چەند سەردانێکی لەو چەشنە بڕیارێکی سەیریدا، ئەویش ئاشانسێکی نهێنی و تایبەتی دابمەزرێنێت. گووتی «هەم نهێنی جیهان دەدۆزینەوە و هەم پارەش پەیدا دەکەین». لەو دەمەدا جەمشید هێڵێکی ئینتەرنێتی ڕاکێشا بۆماڵەوە، لە هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی وڵاتدا کە ژمارەیان لەسەرو هەزار بڵاوکراوە دەبوو بەشداریکرد، بەجۆرێک بەردەوام دەبایە من بچم

لە چەند کتێبخانەیەک ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە کۆبکەمەوە کە ڕۆژانە لە لیستێکی درێژدا دەینوسی. لە ماوەیەکی کەم و کورتدا تەواوی ماڵەکەمان بوو بە شوێنی کەڵەکەبوونی چاپەمەنی جۆراوجۆر کە مامم کاتی نەبوو زۆربەیان بخوێنێتەوە. سەرپلەکەکان، ناو داڵانەکان، سەر سیستمەکەی خۆی، ناو دۆڵابی جل، دۆڵابەکانی مەتبەخەکە پێکڕا پڕبوون لە ڕۆژنامە و گۆڤار کە نەیدەهێشت هیچ پەڕەیەکیان فڕێبدەم یان جیاواز لەو شێوازە و لەو شوێنەی کە خۆی دایناون بیانجوڵێنم یان ڕێکیانبخەم، پێیوابوو ڕۆژێک دێت کە پێویستی بە هەموو ئەو شتانە دەبێت. لەو ماوەیەدا ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر وەک خزمەتکارێک مامەڵەی لەگەڵ مندا دەکرد، هەستمدەکرد مەیلێکی بەهێزی تێدا خولقاوە بۆئەوەی ئازارمبدات، ڕۆژی چەند جارێک تەوالێتەکەی پێپاکدەکردەمەوە، سەپاندی بەسەرمدا کە بەردەوام بۆن بدەم لە خۆم و پێش ئەوەی دەستبدەم لە شتەکانی ئەو دەستم بە دیتۆڵ بشۆم. تادەهات پەیوەندی بە سمایل و لەیلای خاڵۆزامانەوە بەهێزدەبوو کە کچی زەفەر خانی خاڵم بوو. لەیلای زەفەر خان کچێکی زۆر جوان بوو لە پەیمانگای ڕۆژنامەنوسی دەیخوێند کە هەمووی پێنج ساڵ بوو لە شارەکەماندا کرابووەوە، یەکێک بوو لەوانەی من لە کاتی بیرکردنەوە لە ژنهێناندا بیرم لێدەکردەوە، بەڵام جیاوازی تەمەنمان وەها گەورە بوو، کارێکیدەکرد هەموو ئەو جۆرە خەیاڵاتە بە کارێکی گەمژانە بزانم، ئەمە جگە لەوەی وەک بیستبووم پەیوەندی بە کوڕێکی ڕۆژنامەنوسەوە هەبوو. لەوانەش بەدتر، سەیرکردنی ئاسمان ڕوخساری منی زۆر گۆڕی بوو، دەمێکی هەمیشە داچەقاو و لووتێکی زلم بۆ دروستبووبوو کە جاران نەمبوو. جارێک جەمشید گووتی «ئەوەی زۆر سەیری ئاسمان بکات کەپووی ئاوها دەئاوسێت». هۆی ئەوەی گێڕایەوە بۆ فشارێکی

ئەتمۆسفیری کە لە باڵاوە لەسەر لووتی مرۆڤ دروست دەبێت و شێوەیەکی تایبەتی دەداتێ، لە کۆتاییدا گووتی «من ناتوانم وشەی ئەتمۆسفیرت بۆ ڕوونبکەمەوە، دەبێت خۆت زیاتر فێربیت و بخوێنیتەوە». جەمشید لەو ماوەیەدا هەوڵیدەدا تەفسیرێکی زانستی بۆ هەموو شتێک بدۆزێتەوە. بەتایبەت لەبەردەم مندا کە پێیوابوو بەجۆرێک بێدەماغم هەرچییەک بڵێت بێ هیچ بێنەوبەرەیەک باوەڕدەکەم. ئەو ماوەیە بە هیچ جۆرێک لەگەڵ مندا باسی فڕینی نەدەکرد. بە شەو تادرەنگ لە سایت و بلۆگ و پاڵتاڵک و ژوورەکانی چاتکردنی ئینتەرنێتدا دەمایەوە، لەو ماوەیەدا کەرتبوونێکی کوشندە و ترسناکم لە هەموو کاراکتەری خاندا بینی کە پێشتر هەستم پێ نەکردبوو، لەزەتێکی زۆری لەوە دەبینی کە بەناوی جیاواز جیاوازەوە لە سایتەکاندا شت بنوسێت. ئەو چونکە وەک خۆی دەیگووت منی وەک «گوێرەکەیەکی گەورەی گوێنەگری بێگوێ» تەماشادەکرد، زۆربەی کات کۆمپیوتەرەکەی بەکراوەیی دەهێشتەوە. لەکاتی چاتکردندا دەنگی بەرزدەکردەوە و نوسینەکانی لەسەر ڕووماڵەکە بێ زامنێک بەجێدەهێشت. شەوێک دەستی بۆ کۆمپیوتەرەکە ڕاکێشاو بەمنی گووت «تاکە شتێک کە لە فڕین سیحراویترە ئەم جیهانەیە». جەمشید خان لە ماڵپەڕەکاندا چەندین ناوی خەیاڵی هەبوو، لە ناو نێتدا کۆمەڵێک وێنەی جیاواز جیاوازی بۆ خۆی دانابوو، لە هەندێک ماڵپەڕدا بە ناوێک دادەبەزییە سەر نوسەرێک و بە خەیاڵی خۆی چی تۆمەتێک دزێوبایە بۆی دروستدەکرد، هەر خۆی و بە ناوێکی ترەوە لە ماڵپەڕێکی دیدا بەرگرییەکی توندی لەو نوسەرە دەکرد و دەیگووت «گەورەترین قەڵەمی ئەم سەردەمەمانە» و دادەبەزییە سەر نوسەری پێشوو کە هەر خۆی بوو. لە ژوورەکانی چاتدا بەچەندین ناو و بەچەندین دەنگی جیاواز شەڕی دەنایەوە، شەوێک وەک دینییەک و شەوێک وەک

چەپێکی توندڕەو و شەوێک وەک ناسیونالیستێکی کوردی توندڕەو قسەیدەکرد. شەوێک وەک کەسێک دەدوا کە باوەڕی بە توندوتیژییە و شەوێکی دی بە ناوێکی دی و کاراکتەرێکی دییەوە وەک هەڵگری پەیامی لێبوردن و لەیەکدی تێگەیشتن و بەدەنگێکی هێمن و لەسەرەخۆ قسەیدەکرد. ئەوەی سەیربوو ئەو ماوەیە توانایەکی بەرگەگرتنی نائاسایی تێدا دروستبوویوو، نە شەو دەنوست و نە ڕۆژ پشووی هەبوو. زۆربەی بەیانیان لەیلای زەفەر خان دەهات بەدوایدا و بەخۆیەوە گرێیدەدا و پێکەوە دەچوون بۆ جێگایەکی نادیار، هەندێجار من سەرسەختیم دەکرد و دەمگووت بۆ کوێ دەچن و چ کارێکتان هەیە و من بۆنابەن ؟ جەمشید خان هەمیشە دەیگووت کاری ئاشانسەکەمان هەیە. ئەو ماوەیە نەوەک تەنیا جەمشید بەڵکو لەیلای زەفەرخان و سمایلی مامیشم هەر وەک خزمەتکارێک ڕەفتاریان لەگەڵ دەکردم، نەک هەر ئەوە بەڵکو پەتای ڕوانین لە من وەک خزمەتکارێک هێدی هێدی گوازرایەوە بۆ هەموو کەسانی تایەفەکەمان، بەجۆرێک وای لێهات گەر ڕۆژێک جەمشید خان کاری بە من نەبایە، یان دەیناردم بۆ ماڵی زەفەرخان، یان ماڵی ئەدیب خانی مامم یان لای هەر خزمێکی دی کە ئیشی قورسیان هەبایە... من هەموو شتێکم بە بێدەنگییەکی گەورە قەبووڵدەکرد... هێدی هێدی دەبووم بە کەسێکی قەڵەو کە بە جووتێک چاوی ترساو و گێژەوە لە دەرگای ماڵی خزمەکانمانم دەدا و بەدەنگێکی گڕ دەمگووت من جەمشید خان ناردومی، چ کارێکتان هەیە تابیکەم. زۆربەی کات یەکێک دەیبردمە سەرئیشەکە و وەک ماشێنێکی کۆککراو تا تەواودەبووم کارمدەکرد، لە هەر جێگایەک بوومایە نیوەڕوان قاپێک برنجیان دەخستە بەردەمم و بە زەوق و برسێتییەکی زۆرەوە دەمخوارد. ئەو ڕۆژانەی کە خان لە ماڵ نەدەبوو، کاتەکەم بە خوێندنەوەی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە

دەبردەسەر کە لە هەموو کونجێکی کۆشکە کۆنەکەی حیسام خاندا کەڵەکەبووبوون، شتێک کە سەیرم لێدەهات ژمارەی بێشوماری ئەو هەزاران هەزار نوسەرە بوو کە لە ناکاو لە وڵاتی ئێمەدا وەک مێرولە قەتارەیان بەستبوو، دەشیانتوانی لەسەر هەموو شتەکانی جیهان بنوسن لە دەرپێی کورتی ئەکتەرەکانەوە بیگرە تا سەر گەندەڵی سەرۆک حیزب و پەرلەمانتارەکان، هەرکات لە خوێندنەوەی ڕۆژنامەیەک یان گۆڤارێک دەبوومەوە دەبایە خێرا ڕابکەم و سەر بەرزبکەمەوە و سەیری قووڵایی بێسنووری ئاسمان بکەم، تا بتوانم خۆم لە کاریگەری ئەو هەموو قسە هیچانە بتەکێنم کە تووشی هەناسە توندی و ژانەسکیان دەکردم. ماوەیەک وایلێهات جەمشید ئیتر شەوان درەنگ یاخود دەمەوبەیان دەهاتەوە. من دڵنیابووم بە شەو دەفڕێت و بۆ سەعاتی درێژ لە ئاسماندا دەمێنێتەوە، چونکە زۆر جار لە شەوانی باراندا هەموو گیانی دەبووە ئاو و وەک پاسارییەکی نەخۆش و تەڕ دەگەڕایەوە بۆ ماڵێ، لە شەوانی تەپوتۆز و خۆڵبارینیشدا خۆی و جلەکانی وەها پیسدەبوون، ئاشکرابوو کەوتۆتە ناو گێژاوی بەرزتر و چڕتری خۆڵەوە. سەرەتا تەلەفونێکی مۆبایلی بۆ خۆی و یەکێکی دی بۆ من کڕیبوو، بە منی گووت «زۆر گرنگە لە بەرچاوی خەڵک وەک کەسێکی مۆدێرن دەربکەویت». بەڵام هەر کات تەلەفونم بکردبایە و ژمارەکەی منی بدیبایە هەڵی نەدەگرت ... من ڕۆژێک کە کارێکم بە خان هەبوو هێندەم تەلەفون بۆ کرد تەواو بێزارمکرد. شەو کە گەڕایەوە من لە سالۆنەکەدا لە ناو گیزەگیزی مێشولە و عارەقەی گەرمای هاویندا لەسەر قەنەفەکە خەوتبووم، بەتوڕەییەوە هەڵیساندم و مۆبایلەکەی لێسەندم و گووتی «دەزانیت ئەمە چییە ... دەزانیت... ئینسانییەت لە ئادەم و حەواوە بیریکردۆتەوە تا ئەمەی دروستکردوە، ئێستا کەوتۆتە

دەست بێدەماغێکی وەک تۆ کە نازانیت چۆن بەکاریبهێنیت». ئینجا تا توانی مۆبایلەکەی کێشا بەدیوارەکەدا و وردوخاشیکرد. بەرلەوەی سەربکەوێت بۆ ژوورەکەی خۆی گەڕایەوە و بە هێمنی کەسێکەوە کە زۆر لە خۆی دەکات گووتی، من مەخلوقێکی لەوە بێمێشکترم بتوانم لە تەکنۆلۆژیا و مانای ئەم سەردەمە تازانە تێبگەم کە مرۆڤایەتی پێیدا تێدەپەڕێت ... زۆر لەوە بێمێشکترم.

من مانەوەی زۆرم لە ماڵ و دووریم لە جەمشیدەوە تەواو بێزاریکردبووم، بەجۆرێک لە جۆرەکان بە هەقی خۆمم دەزانی بزانم مامم چی دەکات. ئەو بەردەوام دەیگووت «وازم لێبهێنە، ئیشی ئاشانسەکە، هەموو کاتی گرتووم». پاش ماوەیەک زانیم کە لە یەکێک لە بینا بەرزە تازەکاندا بیرۆیەکیان گرتووە و خەریکی کارکردنن. ڕۆژێک بوێریمکرد و چووم بۆ لای سمایل و پێمگووت «سمایل تۆ دەزانیت من و تۆ برا و هاوڕێ بووین، ئێستا تۆ بوویت بە ڕۆژنامەنوسێکی ناسراو و من هیچ نیم... من قەتیش نابم بە هیچ. هەموو وەک کۆڵکێش و خزمەتکار سەیرمدەکەن، ڕاستە ئەوە زۆر ناخۆشە، بەڵام قەبووڵمکردوە و زۆرم بەلاوە گرنگ نییە، بەڵام سوێندت دەدەم بەو هەمووساڵانەی من و تۆ تێیدا ڕایەڵگری خان بووین، مامم ئێستا خەریکی چییە و ئێوە لەو نوسینگەیەدا چی دەکەن؟»، سمایل بە پێچەوانەی عادەتی خۆی، بە پێکەنین و بە هەندێک ڕستەی گشتی و بە کۆمەڵێک ڕوونکردنەوەی پێچاوپێچ لەوانەی شتێک نادەن بەدەستەوە ڕاییکردم.

لەو ماوەیەدا کە خان خەریکی ئاشانسەکەبوو، با هەمیشە بەجۆرێکی نائاسایی و قایم هەڵیدەکرد. زۆربەی ڕۆژ کە مامم

لەگەڵ لەیلادا دەچوون بۆ سەرکار، دەبوو من بە باوەش خان هەڵگرم و بیخەمە پێشی ماشێنەکە و قایشەکەی بۆببەستم.

ڕۆژێک لەیلا لەسەر مێزە گەورەکەی جەمشید دۆسییەکی ئەستووری لێبەجێما کە پڕبوو لە کاغەزی گرنگ. ئەو ڕۆژە تا نیوەڕۆ دەمێک لەیلا بۆ بردنی دۆسییەکە هاتەوە، من دانیشتم و یەکەیەکە پەڕەکانیم خوێندەوە. یەکێک بوو لەو شتە سەیرانەی لە ژیانمدا بینیبووم. فایلی دەیان چیرۆکی سەیر و نهێنی و ترسناک کە پێدەچوو ئاشانسەکەی جەمشید خان ئیشیان لەسەر بکات. چیرۆکی «س. خالید» ناوێک کە حیزب ڕایسپاردبوو دەوڵەمەندێک بکوژێت، بێنەوەی بهێڵێت وەک کوشتن دەربکەوێت. چیرۆکی نەرمین خانێک کە لە ڕێگای برایەکی ئەوەوە پارەیەکی زۆر ڕەوانەی بانکێکی بەلجیکی کرابوو. چیرۆکی دوو سیاسی گەورە کە لەسەردەمی شۆڕشدا کاری سیخوڕییان بۆ بەعسییەکان کردبوو و فایلەکانیان کەوتبووە دەست جەمشید خان. دۆسییەی ئەو پارانەی کە سەرنوسەری ڕۆژنامەیەکی ئەهلی لە ژێرەوە لە دەزگایەکی نهێنی حیزبی وەردەگرت بۆئەوەی هەندێک ناوی دیاریکراو لکەداربکات و تێکیان بشکێنێت. دۆسیەی پەرلەمانتارێک کە ماشێنێکی گرانبەهای بۆ کچێکی قوتابی زانکۆ کڕیبوو کە پێدەچوو پەیوەندییەکی حەرامی لەگەڵدا هەبێت، دواجاریش دۆسییەی هەر یەک لە عەقید فەتحی نەریمان و ڕەسولی مام شایەر و عەبە دنیڤەر کە سێ ئەفسەری پۆلیس بوون و لەژێرەوە ڕا پارێزەر و ڕێکخەر و ئیشکەری ئەو تۆڕانەبوون کە بازرگانی لەشفرۆشیان دەکرد. هەڵبەت چەندەها وردە چیرۆک و دۆسییەی ئاڵۆز و ناتەواوی دیکەش کە من تەواو نەگەیشتمە مانای حیکایەتەکەیان. کە ئەو فایلەم بینی تەواو لە وەزیفە و ئامانجی

ئاشانسەکەی جەمشید خان و وشەی «نهێنی جیهان» لای ئەو تێگەیشتم.

زۆرجار ڕۆژانی هەینی کە بیرۆی ئاژانسەکە دادەخرا، ڕێکەوتیدەکرد چەند کەسێکی نەناسراو دەهاتن بۆ ماڵمان و جەمشید خان لە سالۆنە سەرەکییەکەی خوارەوەدا پێشوازی لێدەکردن. هەر کات میوانێک بهاتبایە، خان بە منی دەگووت بچمەسەرێ و خۆم بە پاککردنەوەی ژوورەکان یان تەوالێتەکانەوە سەرقاڵبکەم، بەڵام هەمیشە ڕێگایەکم دەدۆزییەوە بۆئەوەی گوێبگرم و بزانم چ باسە. جارێکیان ژنێکی گەنجی زۆر جوان هات، لەسەرەتای دانیشتنەکەوە تا کۆتایی هەر دەگریا و لە مامم دەپاڕایەوە کە ئابرووی نەبات، گووتی هەر شتێکت دەوێت لەگەڵ خۆت و خزمەتکارەکەتدا دەیکەم تەنیا ئەو کاغەز و وێنانەم بدەرەوە، بەڵام مامم پێیگووت ئەگەر لە ماوەی هەفتەیەکدا پەنجا هەزار دۆلار دانەنێت هەموو وێنەکان وەک خۆی لە ئینتەرنێتدا بڵاودەکاتەوە ... دوای هەفتەیەک لەو دانیشتنە لە لاپەڕەی سێی ڕۆژنامەکەی سمایلی مامما هەواڵی خۆسووتاندنی ئەو ژنەم بە وێنەوە خوێندەوە. جارێکی دی بەرپرسێکی سیاسی هات کە سەر بە یەکێک لە حیزبە بچوکەکان بوو وەک شەقشەقە دەلەرزی و دەکەوت بەسەر پێڵاوەکانی خاندا کە ئەو نهێنیانەی دەربارەی تێوەگلانی حیزبەکەی لە قاچاغچێتی تلیاکدا لەلایەتی بڵاویان نەکاتەوە... جەمشید هەمیشە داوای پارەی خەیاڵی دەکرد، دڵنیابووم پارەی خەیاڵیش کۆدەکاتەوە، بەڵام ئێستا هیچ یەک لە پارەکانی نەدەهێنایەوە بۆ ماڵێ و لە جێگایەکی تر دوور لە دەستی من و ئاگای من هەڵیدەگرتن. شەوێک لە شەوان مامم لە ماڵەوە خەریکی ناردنی هەندێک بابەت بوو بۆ یەکێک لە ماڵپەڕەکان، کە خان لە ژێر نازناوی

«ج. گەرمیانی» وتاری ئاگرینی بۆ دەنارد و هێرشیدەکردە سەر هەموو ڕۆحلەبەرانی سەر ئەم ئەستێرەیە و هەمیشەش بە ستایشێکی زۆری خاوەنی ماڵپەڕەکە کۆتایی پێدەهێنا و دەیگووت «تەنیا کوردێکی ڕاستەقینەیە لەسەر ئەم ئەستێرەیە». لە کاتێکدا من لە سالۆنەکەدا دانیشتبووم و لەزەتم لەوە دەبینی سەیری ئەو بکەم، یەکێک توند لەدەرگای دا و من بە هێمنی هەستام بیکەمەوە. میوانەکەمان پیاوێکی بەقەڵافەت بوو لە کراسێکی سپی و پانتۆڵێکی ڕەشدا، بێئەوەی چاوەڕوانی فەرمووی من بکات یان لە ناو نارێکی ماڵەکەدا سەری لێبشێوێت، ڕێک بەرەو لای جەمشید خان ڕۆیشت و مامی وەک پارچە جلێکی پیس لەسەر کورسییەکەی خۆی هەڵگرت و هێنایە ناوەڕاستی ژوورەکەوە. مامم کە نەیدەزانی چ باسە کەمێک لنگەفرتێ و هاواریکرد و پاش کەمێک وەک چاوەڕوانی ڕوداوی دواتر بێت بەدەستییەوە وەستا. کابرا دوای دەقیقەیەک وەک ئەوەی بیر لە باشترین چارەبکاتەوە، جەمشیدی فڕێدایە سەر زەوییەکە و دەمانچەیەکی دەرهێنا و خستییە سەر سەری و گووتی «گوێبگرە جەمشید خان، باش گوێبگرە... تا سبەی شەو ئەم کاتە هەموو ئەو وێنانەمان نەدەیتەوە، مەبەستم وێنەکانی عەقید ڕەسوڵە... ئەم دەمانچەیە لەسەرتدا خاڵیدەکەمەوە... تاسبەی شەو». جەمشید خان کە تۆزێک لالێوی خوێناوی بووبوو، دوای ئەوەی کابرا ڕۆیشت دەستیکرد بە جنێودانی من کە لەم شەوەدا دەرگا لە غەریبەیەک دەکەمەوە و دەمەوێت بە کوشتی بدەم و بە مردوویی ببینم و خۆشحاڵم بەوەی کە بەوجۆرە سووکایەتی پێکراوە. من ئەو شەوە بۆیەکەمجار بڕیارمدا بە هێمنی قسەبکەم. بە خانم گووت من ئاگاداری هەموو شتێکم، ئەو شتانەی ئەو دەیکات هەمووی شتی بێمانا و ترسناکە و تێناگەم لەیلای زەفەر خان و سمایل چۆن

لەگەمەیەکی واناشیریندا لەگەڵ ئەودا تێوەگلاون، پێمگووت گەر پارەی دەوێت، ئێمە بەشی ئەوەی تا چەند ساڵی تر ئاسوودە بژین پارەمان هەیە و دەتوانین بچین بۆ بارانۆک لەوێ خانوویەک دروستبکەین و دوور لەم دونیایە، دوور لەم هەموو رۆژنامە پروپوچ و ماڵپەڕە پڕوپوچانەی ئینتەرنێت بژین، وەک جاران پاک و ئاسوودە... گووتم دەتوانین سمایل لەگەڵ خۆماندا بەرین و رۆمانە ئینگلیزییەکانی بهێنێت و لەوێ بۆمان بخوێنێتەوە و لەم جیهانە پیس و پۆخڵە دووربکەوینەوە. جەمشید هەموو قسەکانمی وەک بۆچوونی رۆمانسییەکی بێشەرەف ناوزەدکرد و گووتی ئەو پێیدەڵێن «خانی خانانی ئینتەرنێت»، ئەوەشی دەست بەسەر ئەو دونیایەدا بگرێت واتە دەستی بەسەر ژیان و ناوبانگ و کەرامەتی هەموو ئینسانەکاندا گرتووە. گووتی جاران تەنیا دیکتاتۆرە گەورەکانی وەک ستالین و هیتلەر و مۆسۆلینی دەیانتوانی شتی وابکەن، ئەوانەی سوپا و دەوڵەت و پۆلیسی نهێنیان هەبوو، ئێستا بەسە ماڵپەڕێکت هەبێت بۆئەوەی ئەوەبکەیت، خەیاڵ و عەقڵی هەزاران کەس بەوجۆرە بجوڵێنیت کە دەتەوێت، ئەو کەسەیان لەلا خۆشەویستبکەیت کە پێتخۆشە، وابکەیت رقیان لەوەبێت کە تۆ مەبەستتە، ئەو کەسە بەرزبکەیتەوە کە دۆستتە و دوژمنەکانت تێکبشکێنیت و بۆ هەتاهەتایە ریسوایانبکەیت، چونکە ئینسان لە جەوهەردا بوونەوەرێکی بێدەماغە و هەرچی لەوێدا بڵاوبکرێتەوە باوەڕی پێدەکات. ئینجا کەوتە وەسفێکی دووروودرێژی تیورەیەکی تازەی خۆی، دەربارەی مێشکی مرۆڤ. ڕای وابوو کە مێشک تاکە ئۆرگانی لەشی مرۆڤە کە بەپێچەوانەی ئۆرگانەکانی تری وەک دڵ و سی و پەنکریاسەوە پێکهاتی لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت و گەشەیەکی ناهاویەکی کردوە، سووربوو لەسەر ئەوەی عەقڵ شتێکە تەنیا لای دەستەبژێرێکی زۆر زۆر بچوک

لەسەر ئەم ئەستێرەیە هەیە و بە شانازییەکی زۆرەوە پێی لەسەر ئەوە داگرت کە لە داهاتووی زۆر دووردا هەموو ئینسانەکان لەشیان دەپوکێتەوە و تەنیا عەقڵیان گەورەدەبێت و ئەو پێشەنگی دەرکەوتن و سەرهەڵدانی ئەو نەسلە تازەیە. گووتی لە کاتێکدا ئەو نزیکە لەوەی بە هۆی ئەو تۆڕە گەورەیەوە کە دایمەزراندوە شتێکی گەورە بۆ میللەت بکات و دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لەناو ئینتەرنێتدا دابمەزرێنێت، بێناموسێکی ڕۆمانسی وەک من، بێشەرەفێک کەسەر بەم سەردەمە نیم، دەمەوێت بیبەمەوە بۆ ناو دونیای پڕ پشقلی بەرغەل و شیاکەی وشکی مانگاکانی لادێ. من سووربووم لەسەر ئەوەی، ئەمەی ئەو باسیدەکات جۆرێکە لە وەحشییەتی تازە... وەحشییەتێک کە لە وەحشییەتی هەموو دیکتاتۆرەکانی پێشتر ناشیرینتر و کوشندەترە، گووتیشم سەردەمێک دێت کە چۆن مرۆڤایەتی خۆی لە هێزی فیرعەونە کۆنەکان ئازادکردوە، خۆشی لە هێزی ئەمجۆرە فیرعەونانە دەتەکێنێت و هەمووتان وەک قەساب و مرۆڤکوژ و بێویژدان دەچنە مێژووەوە. قسەکانم وەها توندو کاریگەر بوون جەمشید خان گڕیگرت و بڕیاریدا سێ ڕۆژ لە ژوورێکدا دیلمبکات و نان و ئاوم نەداتێ و گووتی دواتریش تا داوای لێبووردن لەم سەردەمە تازانە نەکەم، نایەمەدەرێ. هەرچەند هەوڵمدا و گووتم «ئەی سەردەمە تازەکان بمبوورن» بەڵام جەمشید خان ڕای وابوو کە من ڕۆمانسییەکی حیزم و هەر شتێک دەیڵێم لە دڵەوە نییە.

ئەو ساتەی منی لە ژوورە کۆنەکەی نەنکمدا دیلکرد ، نەمدەزانی ئیتر تا چەند مانگێکی تر چاوم بە جەمشید خان ناکەوێتەوە.

بەڵام وا ڕێکەوت لە شەوی دواتردا پێشبینییە دێرینەکەی سمایل هاتەدی... ئەو لە ڕوداوێکی ترسناکدا، کە منی بەتەواوتی لە دونیادا هەتیوکرد، ژیانی خۆی لەدەستدا.

## کۆتاییەکانی جەمشید خان

ئەو ماوەیەی خان خەریکی ئاشانسەکەی بوو، بەکۆمەکی لەیلا و سمایلی مامم، دەیان گەشتی شەوانەی بە ئاسماندا ئەنجامدابوو، لەیلا چووبووە جێگای من و لەپاڵ سمایلدا بووبوو بە ڕایەڵگری دووەمی. مامم لە ئاسمانەوە چاوەدێری جوڵە و هاتوچۆی دەیان کەسی کردبوو، لەسەربانەوە دابەزیبووە ناو نوسینگەکانیان و دۆسییەکانی دزیبوون، لە پەنجەرەوە وێنەی ژیانی تایبەتیانی گرتبوو، گوێی بۆ قسە و تەلەفونیان ڕادێرابوو. لە ماوەیەکی کەمدا خەڵکانێکی زۆر بووبوون بە قوربانی ئەو گەمە کوشندانەی ئەو. لەیلا و سمایل وەک خان خەونی لێخستبێتن و کردبێتنی بە ئامێری بچوک و بێهۆشی دەستی خۆی، بێهیچ بیرکردنەوەیەک هەموو کارێکیان بۆ جەمشید جێبەجێکردبوو، لە پاڵیشدا بەشێکی ئەو پارانەی لە خەڵکانی دی وەدەستیهێنابوو بەخشیبووی بەوان. دیارە دواجاریش سەروەتە زۆر و نهێنییەکەی بۆ لەیلای زەفەر خان مایەوە کە بە ڕێگایەکی نادیاردا پارەکانی برد و کەس نەیبینییەوە. کێشەی هەرە گەورەی مامم ئەو کاتە دەستی پێکرد کە کەوتە هەڕەشەی ئاشکراکردنی پەیوەندی پۆلیس بە تۆڕێکی گەورەی بازرگانیکردن بە ژنانی لەشفرۆشەوە کە لە باشووری عێراقەوە هەڵدەهاتن. ئەفسەرەکانی پۆلیس کەرەستە و هێزی ئەوەیان هەبوو دوای

خان بکەون و نهێنییەکانی بدۆزنەوە و لە شێوازی ئیشکردنی تێبگەن. ئەو شەوەی خان منی لە ماڵەوە دیلکرد، بۆ شەوی دوایی لەگەڵ سمایل و لەیلادا بۆ یەکێک لە فەرمانە نهێنی و کارە تایبەتییەکانیان دەردەچن. ئەفسەرەکان دوو چەکداری مەدەنی دەخەنە دوایان و لە زوڵمەتی شەودا کاتێک جەمشید لە ئاسماندایە و لەیلا و سمایل لەنگەری بۆ دەگرن، لەساتێکی گونجاو و لەباردا چەکدارەکان بە مەبەستی کوشتن دەیاندەنە بەر دەسترێژ.

لەوێدا دەم و دەست سمایل دەکوژرێت و پەتی خان جارێکی دی بەردەبێت و با بە ئاسماندا دەیبات.

کوشتنی سمایل بۆ من گورزێکی کوشندەبوو، گەرچی لەو چەند ساڵەدا چیتر هاوڕێ زۆر نزیکەکەی جاران نەبووین، بەڵام یادم نییە لەو زیاتر هاوڕێیەکی نزیکی دیکەم هەبووبێت. لە پرسەکەیدا لە هەمووان زیاتر گریام و دوای ئەوەش ماوەیەکی درێژ کەوتمە ناو غەمۆکییەکی گەورەوە. بۆ ئەوەی لە بازنەی ئەو غەمە گەورەیە دەرچم، ڕۆژێک دوو کرێکارم هێنا و هەرچی ڕۆژنامە و گۆڤارێک لە ماڵەکەدا کەڵەکەبووبوو خستمە پشتی پیکابێک و لەدەرەوەی شار هەموویانم سووتاند. دواتەوە ماڵەکەم سەرلەبەری بە دیکۆرێکی نوێ ڕێکخستەوە، دیوارەکانم بۆیەکردەوە، مۆبیلێکی گرانی زۆرم کڕی. چووم لای فۆتۆگرافێک چەند وێنەیەکی گەنجی خۆم و سمایلم گەورە کرد و لە هەموو ماڵەکەدا هەڵمواسین.

ئیدی ڕۆژانە چەند سەعاتێک دەچوومە کافیتریای لاس و خەزال کە تازە لە نزیک ماڵی حیسام خانەوە کرابووەوە. لەو کافیتریایەدا دەستمکرد بە خوێندنەوەیەکی راستەقینە و بڕیارمدا

ئاستی خوێندەواری خۆم وەها بەرزبکەمەوە، بتوانم لە داهاتوودا چیرۆکی جەمشید خان بنوسمەوە.

بەڵام ئەمجارەیان زۆری نەبرد کە خان سەری هەڵدایەوە.

لە شەوی کوشتنی سمایلدا، با جەمشید بەرەو خۆرئاوا دەبات و هەشتا کیلۆمەتر دوور لە شاری ئێمە لە کێڵگەیەکی خاڵیدا دەیخاتە خوارێ. کێڵگەکە موڵکی بەرپرسێکی گەورەی وڵات بوو. دواتر جەمشید گووتی «لە هەر جێگایەکی دیکەشدا بکەوتبامایەتە خوارێ هەر وەکو یەک بوو، لەم نیشتیمانەدا مرۆڤ لە هەر جێگایەکی ئاسمانەوە بەربێتەوە هەر دەکەوێتە ناو موڵکی مەسئولێکەوە». بەرپرسەکە ئەندامی بیرۆی سیاسی یەکێک لە حیزبە گەورەکانمان بوو، ناوی «شاسوار بەگی هیجری» بوو زیاتر هەر بە بەگی هیجری بانگیاندەکرد، ئەو پیاوە وەها زەنگین و بەدەسەڵات بوو دەوڵەتێک بوو بۆ خۆی. بۆ هەر شتێک فەرمانبەرێکی هەبوو، بەوەدا خۆی فریانەدەکەوت سەردانی زەوی و زار و کێڵگە و بێستانەکانی بکات، یەکێک هەفتانە بە کامێرایەکی فیدیۆوە بەسەر زەوییەکانیدا دەگەڕا و هەرجارەی لە جێگایەکەوە دیمەنی ئەو موڵکانەی بۆ دەگرت. ئەویش هەر کاتی هەبایە دادەنیشت و تەماشایدەکرد و تێبینی و ئامۆژگارییەکانی خۆی بە جوتیاران و ئەندازیاران و پاسەوانەکان دەدا.

ئەوەی مامی هەڵگرتەوە کەسێک بوو ناوی «غەفاری فیدیۆ»بوو. ئەو لە کاتی وێنەگرتندا، جەمشید خانی بەبێهۆشی لە کونجێکی موڵکەکانی بەگی هیجریدا دۆزییەوە.

هەموو دەیانزانی شاسوار بەگ یاسایەکی هەبوو دەقەکەی وەهابوو «ئەوەی لە موڵکی مندا بێت... موڵکی منە». ئەوی

ڕۆژ کە غەفار، مامی وەک ئاسکێکی بچوک و بریندار لە بەردەمی شاسوار بەگدا دانا، ئەو بەجیدییەتی کەسێکی وردەکارەوە، دوای پشکنینێکی زۆر و لێوردبوونەوەیەکی پسپۆرانە نەیتوانی شتێک لە ماهیيەت و مانای ئەم مەخلوقە سەیرە تێبگات، کە ئەگەر جلی کوردی لە بەردا نەبایە دەیگووت لە ئەستێرەیەکی دییەوە هاتووە. دوای ئێستێکی باش و بیرکردنەوەیەکی ورد بە غەفاری گووت «بیبە بۆلای پزیشکەکان بزانە دەڵێن چی، گەر پێویستیشی کرد بە چێشتکەرەکان بڵێ با نانی بدەنێ. من ئێستا کارم هەیە و تا ئێوارە دەست بەتاڵ نابم. با دەمێک گەڕامەوە دکتۆر دلاوەر خۆی بێت و ڕاپۆرتی خۆیمان بداتێ، تا بزانین ئەمە چۆن جانەوەرێکە». لە ئێوارەدا جەمشید کەمێک هۆشی هاتبووەوە بەرخۆی و یەکەم ڕستە لە زاری ترازا ئەوە بوو کە ئەو دەتوانێت بفڕێت و دەیەوێت بفڕێت. ئێوارە، دکتۆر دلاوەر کە سەرۆکی ئەو تیپە پزیشکییە بوو کە بەردەوام لەگەڵ «بەگی هیجری» دا دەهاتن و دەچوون، بە ڕاپۆرتێکی وردەوە چوو بۆ لای بەگ. ئەو وەک هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵێک سیاسی دیکەدا لەسەر مێزێکی زۆر گەورە و ڕازاوە نانی دەخوارد، کاتێک دکتۆر ڕاپۆرتەکەی خستە بەر دەست، ئەو بەدەم مڵچەمڵچی نانخواردنەوە گووتی «همم، دکتۆر من دەستم پیسە، ئێستا ئەوەندەم پێبڵێ ئەمە چ جۆرە مەخلوقێکە کەوتۆتە ناو موڵکی منەوە، ئێستا بەم دەستە چەورانەوە کاغەزی تۆم بۆ ناخوێندرێتەوە، بەڵام مەراقمە بزانم چەشنی ئەم جانەوەرە چییە». دکتۆر دوای هەندێک قسەی گشتی گووتی «بەگی هیجری جەنابتان لەسەر هەقن، ئەم پیاوە دیاردەیەکی ڕیزپەڕ و ناوازەیە کە دەشێت وێنەی دەگمەن بێت، لەبەر هۆیەکی نەزانراو، لەشی تەواوی کێشی خۆی ونکردوە و تووشی پوکانەوەیەکی گەورە هاتووە». ئامارەشی بەوەدا کە نەخۆشەکە

هیچی ئەوتۆی دەربارەی خۆی بیرنەماوە، ئەوە نەبێت کە ناوەکەی بە خان دوایی دێت و دەڵێت کەدەتوانێت بفڕێت. بۆ دوو ئێوارە دواتر حاڵی مامم کەمێک باشتر بووبوو، بەو خواردنە چەورانەی چێشتکەرانی بەگی هیجری دەرخواردیان دەدا هێز و تینێکی تێگەڕابوو، کە بردیانە بەردەم بەگی هیجری و لێیپرسی تۆ کێیت و دەتوانیت چی بکەیت، مامم گووتی «نازانم من کێم، بەڵام دەتوانم بفڕم». بەگی هیجری کە یەکەمجار مامی لە ئاسماندا بینی وەختبوو لە سەرسامیدا ببورێتەوە، لەو پازدە ساڵەی پێشوودا بۆ کاروباری خۆی و حیزب تەواوی دونیا گەڕابوو، بەڵام عاجباتی وای لە هیچ جێگایەک نەبینیبوو، ئەو شەوە کە مامم دابەزی شاسوار بەگ یەکسەر فەرمانیدا مامم لە شوێنێکی قایمدا دیلبکەن نەبا بچێتە خەیاڵییەوە هەڵبێت، هەمان شەو تەلەفونی بۆ ئاسنگەرێک کرد کە قەفەزێکی گەورەی بۆ دروستبکات و پەتێکی قوفڵداری بۆ بسازێنێت، تا لە دۆخی فڕیندا و لە کەشکەشانی ئاسماندا خۆی بەرنەدات و بڕوات. هەستدەکەم ئەوە سەرەتای تێکشکانی ڕاستەقینەی مامم و بێزاربوونی بوو لە هەموو شتێکی ئەم نیشتیمانە. مامم هەمووجارێک گەرچی بڕێکی زۆری یادەوەری خۆی دەدۆڕاند و بەجۆرێکی تر لەدایکدەبووەوە، بەڵام هەمیشە هەستێکی قووڵی بە کەرامەتی خۆی وەک مرۆڤ لەلادەما، ئەو لەقەفەزنانە ناهەق و زنجیرکردنە جەمشید خانی زۆر برینداركرد. لە شەوی یەکەمەوە هەستیکرد کە بەگی هیجری وەک حەیوانێکی ناوازە سەیریدەکات و دووروونزیک لە جنسی ئادەمیزاد داینانێت، ئەو لە یەکەم شەوەوە هەستیکرد شاسوار بەگ دایناوە تا وەک مەیمونێک یان بابەتێکی سەرسامکردن و کەیفکردن بەکاریبهێنێت. مامم لەوەدا بەهەڵەدا نەچووبوو. جەمشید ئیدی لە کاتی ئاساییدا لە زیندانێکی ڕووتەدا، بێ هیچ هەلومەرجێکی

باشی ژیان دیلدەکرا و شەوانی کەیف و ئاهەنگ، کاتێک بەگی هیجری و سیاسییەکانی دی کۆدەبوونەوە، بەگ فەرمانیدەدا و مامميان لە قەفەزەکەیدا دەهێنا و پەتیان لە کەمەری دەبەست و بە هەوادا هەڵیاندەدا. سیاسییەکان و ژن و منداڵیان کەیفێکی زۆریان بە بینینی مامم لە هەوادا دەکرد. فڕینەکانی جەمشید خان لەناو توێژی سیاسییە باڵاکاندا بەجۆرێکی گەورە دەنگیدایەوە، بە چەشنێک منداڵی هەموو سیاسییەکان، کوڕ و کچە بچوکەکانیان بە تایبەت داوەتدەکران بۆ سەیری جەمشید خان و گرتنی پەتەکەی و ڕاتەکاندنی وەک ڕاتەکانی کۆلارەیەکی کاغەز. هەمیشە شەوانی ئاهەنگ لە ساتی گەیشتنی بەزمەکاندا بە ترۆپک، بەڕێوەبەری مێز و ڕێکخەری پرۆگرامەکان کاتێک فڕینی خانی باڵداری ڕادەگەیاند، دەبوو بە هەرا و فیکە و چەپڵەڕێزانێکی گەورە. هەمیشە دوو پاسەوانی چەکدار جەمشیدیان لە قەفەز دەردەهێنا و لە بازنەیەکی دیاریکراودا پەتیان لێدەبەست و بەرزیاندەکردەوە. هێدی هێدی وایلێهات بەگی هیجری، بچووبایە بۆ هەر شوێنێک قەفەزەکەی جەمشید خانی لە ماشێنێک دەبەست و دوای ئەوەی پەردەیەکی ڕەشی بەسەردا دەدا، لەگەڵ خۆیدا دەیبرد... ئیدی خان بوو بە لیبوکی گەورەی هەموو حوکمدارانی وڵات، کەمەکەمە خۆشی لەگەڵ ڕۆڵی لیبوک و گاڵتەجار و مرۆڤی نزمدا ڕاهات، ئیدی بۆئەوەی غەم و وەڕزی نەیکوژێت لەسەرەوە بە ئاماژە یاری لەگەڵ منداڵاندا دەکرد، وەک لیبوکەکان دەموچاوی ڕەنگاوڕەنگ دەکرد، لەسەرەوەڕا شیرینی و چکلێتی هەڵدەدا. بەگی هیجری بەوەوە نەوەستا لە بۆنەکانی خۆی و خزمانیدا بیخاتەگەڕ، دەشیدایە هاوڕێ و دۆستان کە لە ئاهەنگ و سەفا بەردەوامەکانیاندا بۆ شتێکی نوێ دەگەڕان، دەیدا بە حیزبە هاوپەیمانەکان تا لە کاتی کۆبوونەوە نائاساییی و کۆنگرەکانیاندا

کەیفی پێبکەن. جەمشید لەو ماوەیەدا لە هەموو بۆنەکاندا بەشداریکرد، ژن و منداڵی سیاسییەکانمان بە ناوی «مەیمونە باڵدارەکە» دەیانناسی، ئەندامانی بیرۆی سیاسی حیزبیش ناویان نابوو «مەیمونە بەرزەفڕەکەی نیشتمان» کە وەک بەگی هیجری تەفسیریدەکرد، پەیوەندییەکی مەجازی لەگەڵ گوزارەی «هەڵۆ بەرزەفڕەکانی نیشتمان» دا هەبوو، کە لە ساڵانی زوودا باوبوو. پێش ئاهەنگە گەورەکان بۆنەوەی بۆنی نەیەت بە سۆندە لەقەفەزەکەیدا دەیانشت، مانگی جارێک سەرتاشێکی تایبەتی دەهات و سەری جەمشید خانی سفردەکرد، چونکە هەندێک رایان وابوو بە سەر سفری پتر لە بابەتی کەیف دەچێت. بەهۆی مامەوە ناوبانگی بەگی هیجری وەک کەسێک کە شتی سەیر و سەمەرەی لادەستدەکەوێت بە هەموو لایەکی مەملەکەتدا ڕۆیشت. هەندێک لە برادەرەکانی خۆی ئیرەییان پێدەبرد، هەندێک بەڕاستی پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد کە مامم بکڕنەوە و ویستیان لەدەست بەگی دەربهێنن، بەڵام بەگ گوێی لەو قسانە نەدەگرت و قایل نەبوو نرخی لەسەر دانێت. خانی مامم بەدرێژایی ئەو ماوەیە لە قەفەزەکەی خۆیدا ئازارێکی گەورەی دەچەشت و بەبێدەنگییەکی زۆرەوە سووکایەتی .و لاقرتییە قورسەکانی هەمووانی لە ئەستۆ دەگرت. سەرەتا چەند جارێک بە بەگی هیجری گووت کە من مرۆڤم و مەیمون نیم، جارێک لە ئاهەنگێکی گەورەدا کە میوانەکان کەوتنە ئەوەی توێکڵی فستق و ناوکی شووتی و دەنکە گێلاسی ڕزیوی تێبگرن، خان لە قەفەزەکەیدا تووشی دۆخێکی هیستیری هات و کەوتە هاوارکردن و بە دەست و قاچ وەک مەیمونێکی بریندار سەمایدەکرد و نەفرەتی بە هەموولایەکدا دەنارد، لەو ڕۆژەوە بەگی هیجری هەرکات بیهێنایە بۆ نمایش، لەزگەیەکی ئەستووری لە دەمی دەدا و نەیدەهێشت زاری بجوڵێنێت. بەڵام تورەبوونەکانی مامم

بەوەوە نەوەستا، لە ئاهەنگی لەدایکبوونی کچی بەرپرسێکی گەورەدا، کاتێک هەموو توێژی سیاسی مەملەکەت بۆ ئێوارەیەکی ئەفسانەیی کۆبووبوونەوە، وەختێک جەمشید خانی دەمبەستراویان بۆ ئاسمان هەڵدا، خانی زامدار و تورە کە مانەوەی دوورودرێژی ناو قەفەس تێکیشکاندبوو، لە ئاسماندا زریزەی پانتۆڵەکەی کردەوە و لەسەرەوەڕا میزیکرد بەسەری هەموویاندا... دیارە ئەو ئێوارەیە هەندێک خواردن و جل و بەرگی هەندێک سیاسی بەناوبانگ و دەموچاوی چەند خانمێکی بەڕێزی نیشتیمان پیسبوون، بەڵام بۆنەوەی کەس هیچ بەسەر خۆیدا نەهێنێت، هەموو بێدەنگیان لێکرد و لەوێدا کەس هیچی نەگووت. ئەو شەوە بەگی هیجری بەڕاستی لە خانی مامم تورەبوو و خۆی بە حەیزەرانێکی تایبەت کەوتە گیانی، لەو شەوەوە دەرپێیەکی ئەسبێستی قوفڵداری بۆکرد تا جەمشید خان نەتوانێت لە بەرزییەوە میزبکات. گەرچی ئەو شتە سەیر و سەمەرانە لە مەیمونەکەی بەگی هیجری دەرکەوتن، بەڵام نرخی تادەهات دەچووە باڵا و خەڵکانێک هاتنەپێشێ بەڕاستی دەیانویست بیکڕن و بیخەنە سەر موڵک و سەروەتی خۆیان. زۆری نەبرد لە سەوداومامەڵەیەکی سەیردا بەگی هیجری خانی باڵداری لەدەستبووەوە و گۆڕییەوە بە شتێکی دی. دەمێک هاوپەیمانی هەر دوو حیزبە گەورەکەی وڵات سەرکەوتنێکی گەورەیان لە هەڵبژاردندا بەدەست هێنا، شەوی ئاهەنگ ئاڵایەکی کوردستانیان لە هەر دوو قاچی جەمشید خان بەست و لەگەڵ فیشەکەشێتە و یاری ئاگرین و تەقینەوەی ڕەوشەنداردا هەڵیاندا بۆ ئاسمان، دەڵێن ئەو شەوە هەموو سەرۆکە گەورەکانی وڵات لەوێ خانی باڵداریان بینیوە و کەیفیان بە تەماشاکردنی هاتووە، بەڵام ئەوە قسەیەکە من لێی دڵنیانیم و خانیش بەچاوی خۆی کەسیانی نەبینیوە... لەو شەوەدا کە ئەندامانی بیرۆی سیاسی

هەر دوو حیزبەکە کۆبوونەتەوە و دەخۆنەوە و کەیفدەکەن و مەستن، لە گەرمەی مەستیدا، مەجید ژیران کە وەزیرێکی داهاتووی کابینەی هاوبەشە، داوەتی بەگی هیجری دەکات کە دەستێک کۆنکەن بکەن، ئەگەر بەگی هیجری دۆڕاندی ئەو خانی باڵداری بە تەلارێکی گەورە کە لە ناوەڕاستی شاردا هەیەتی پێبگۆڕێتەوە، ئەگەر بردیشییەوە، ئەو پێنج دۆنم زەوی باش و بەبەرەکەتی خۆی پێشکەش بە شاسوار بەگ دەکات. ئەگەر فشاری ژنەکەی نەبایە بەگی هیجری گرەوی وەهای قەبووڵ نەدەکرد، بەڵام خانمی خێزانی کە زۆر ڕقی لە ژنە جوان و لەخۆباییەکەی مەجید ژیران بوو، مێردەکەی بانگکردە لاوەو گوتی دەبێت ئەو گرەوە قەبووڵبکەیت و بەخۆشتی بدۆڕێنیت، چونکە ماوەیەکی دی کەس سەیری ئەم مەیمونە باڵدارە ناکات کە تۆ پەت لە قوونی دەبەستیت و هەڵیدەدەیت بۆ ئاسمان، بەڵام تا قیامەت ئەو قەسرەمان بۆ دەمێنێتەوە و دەیدەین بە دیاری بە یەکێک لە منداڵەکانمان.

بەگی هیجری نابەدڵ، وەک یەکێک گەنجینەیەک زێڕ بدۆڕێنێت، مامی لە قوماردا دۆڕان.

ئەو گرەوە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ژیانی مامم هەبوو. مەجید ژیران خۆی پیاوێکی سەیر و فرەهەوا بوو، زوو خولیای شت دەپەڕییە سەری و زووش دەگۆڕا و پەشیمان دەبووەوە. ئەوشەو کە مامیان بە پەت و قەفەز و ئاڵاکەی کوردستانەوە گواستەوە بۆ ماڵی ئەوان، لە ڕێگا هەستیکرد هەڵەیەکی گەورەی کردوە. هەواڵی گۆڕینەوەی کۆشکەکە بەم مەیمونە کەچەڵە، ژنەکەی ژیرانی تووشی هیستریایەکی گەورەکرد، خانم کە لە تورەییدا ئاگری لێدەبووەوە، بە شیرەیەکی بەرز کە هەم جەمشید خان و هەم پاسەوانەکانی دەوروبەری ماڵیش گوێیان

لێیبوو بە مێردەکەی گووت «هەقە نازناوی ژیران لە خۆتبکەیتەوە و بۆ شتێکی تر بگەڕێیت لەگەڵ بێعەقڵییەکەتدا بگونجێت ... ئەوە هەمووی پیلانی ژنە ڕەزاقورسەکەی شاسوار بەگە کە چاوی هەڵنایەت من لەو قەسرەدا بژیم... من ئێستا چی لەم مەیمونە میزبەخواکەرەی تۆ بکەم کە دونیا لە تەماشای وەڕزبووە».

مەجید ژیران ماوەیەکی درێژ قەفەزەکەی مامی لەبەر هەتاو و باران و سەرمای شەودا جێهێشت بێئەوەی ئەزیەتی ئەوە بداتە بەر خۆی شوێنێکی لایەق بە مرۆڤی بداتێ. نزیکی مانگێک جەمشید خان لە تاریکی ناو قەفەزەکەیدا دەژیا، بێئەوەی کەس دەستبەرێت و چادرەکەی سەری هەڵبداتەوە، ڕۆژانە یەکێک لە خزمەتکارەکان هەندێک نان و ئاوی کەمی دەدایە و بەوە لە مردن دەگوزەرا و دەربازی دەبوو.

دوای مانگێک لەوە. مەجید ژیران داوەتی ژمارەیەک بەڕێوەبەری گەورەی کۆمپانیا تورکییەکان دەکات، کە دوو باغی گەورە و شارێکی یاری و هەزاران یەکەی نیشتەجێبوونیان لە شارە گەورەکانی هەرێمە فیدرالییەکەماندا بونیادنابوو، لە گەرمەی قسە و کەیفکردندا، کاتێک تورکەکان تانەی ئەوەی لێدەدەن کە کورد خاوەنی هیچ شتێکی تایبەتی نییە، ئا لەویادا ژیرانی دڵ بریندار جەمشید خانی بیردەکەوێتەوە و بڕیاردەدات موعجیزەیەک پیشانی ئەم تورکە لووت بەرزانە بدات کە پێشتر لە هیچ جێگایەکی دونیادا نەیاندیوە و هیچ میللەتێکی تریش جگە لە ئێمە خاوەنی وەها مەخلوقی عاجباتی نییە. ئەو شەوە یاوەرەکانی مەجید ژیران، خانێکی لاواز و نیوەهۆشیان بەسەر میوانەکاندا بەرەو ئاسمان بەردا، خانێکی نەخۆش کە کەمخۆراکی و دووری لە هەوای پاک خەریکبوو دەیکوشت. خان

لای میوانە تورکەکانمان شتێکی نەبینراو و سەیربوو، ئەو بەڵێندەرەیان کە دەبوو ئیدارەی شاری یارییەکە بگرێتە دەست، دەمودەست خەیاڵی کڕینەوەی خانی کەوتە سەر، چونکە دڵنیابوو ئەوەی دەیبینێت بابەتێکە دەتوانێت لە شاری یارییەکەدا دونیای پێ بجۆشێنێت.

پاش هەفتەیەک لەوە جەمشید خانیان فرۆشتەوە بە کۆمپانیایەکی تورکی.

ئەو ماوەیە زۆربەی تەلەفزیۆنەکانی وڵات یەک لەسەر یەک ڕیپۆرتاژیان لەسەر شاری یارییەکە دروستدەکرد و یەک لە دوای یەک بایەخی ئەو شارەیان بۆ ناووناوبانگی هەرێمەکەمان باسدەکرد. ڕۆژێک لەیەکێک لەو کەناڵانەوە من جەمشید خانم لە قەفەزەکەیدا بینییەوە، دەستێک جلی دەڵبی لیبوکیان بە ڕەنگی ئاڵاکانی نیشتیمان لە بەرکردبوو و چەپکێک گوڵی گەورەیان دابووە دەست و لە ناو قەفەزەکەدا گوڵەکانی ڕادەوەشاند. من لە تەلەفزیۆنەکەی کافیتریای لاس و خەزالەوە، ئەوم بینی. خۆی بوو جەمشید خان بوو، من نەبێت هیچ کەسێکی دی لەو شێوە و ڕوخسارەدا نەیدەناسییەوە، هەر شتێکی دونیام لێبزربایە ئەوم لێ بزرنەدەبوو، هەر شتێکی دونیام لێتێکچووبایە ئەوم لێ تێک نەدەچوو.

هەمان شەو سوار ماشێن بووم و بەرەو خۆرئاوا ڕۆیشتم و دوای چوار سەعات لە بەر دەرگای ئەو شاری یارییە گەورەیەدا وەستام. کە گەیشتم شەو درەنگ و دەرگاکان هەموو داخرابوون... شار خەوتبوو، من بە دڵێکی پڕەوە لە بەر دەرگایەکدا دانیشتم و گریام، بەڵام پاسەوانەکان وەک سروشتی هەمیشەیی خۆیان فەرمانیان دامێ دووربکەومەوە و بڕۆم و

سبەی ئێوارێ بگەڕێمەوە. هەموو شەو وەک شێت بەو شارەدا سوڕامەوە و سەیری ئاسمانم دەکرد، دەمگووت بەڵکو بشێت خان لە نێوان ئەستێرەکاندا ببینم. هەشت مانگ بوو خان ونبووبوو، بۆ شەوی دوایی چوومە ناو شاری یارییەکەوە، لە هیچ شوێنێکەوە جێگایەک دیارنەبوو کە سەکۆی نمایشی ئەو بێت، من هەموو جێگاکان گەڕام و ئاسەوارێکی ئەوم نەبینی، تەنیا لە دەی شەودا بینیم بە نمایشێکی تایبەت خانیان لە قەفەزەکەیدا هێنا. هەمان ئەو جلە سەیرانەی لەبەردابوو کە لە تەلەفزیۆندا بینی بووم، هەمان چەپکە گوڵی بەدەستەوە بوو، هەستمکرد هەست بە کەساسییەکی قووڵ دەکات، هەستدەکات بە زۆر کراوە بە گاڵتەجاڕ. دەستەوەستان بووم و نەمدەزانی چی بکەم ، لەناو لێشاوی ئەو سەدان منداڵ و گەورەیەدا کە دەیانگووت پیاوە باڵدارەکە هات، ئەو منی نەدەبینی، بە هەموو هێزی خۆم هاوارمکرد جەمشید خان، جەمشید خان، بەڵام ئەو نەیبیست....
سێ شەو بەو جۆرە ڕۆیشتم و دوای قەفەزەکەی کەوتم، بەڵام پاسەوانەکان دەیانبرد و لە جێگایەک کە دەنگی کەسی نەدەگەیشتێ دایاندەنا و لەسەر دوو بەکرەی گەورە بەریاندەدایە ئاسمان. شەوی چوارەم هیچ هەوا نەبوو لەبەرئەوە جەمشید خان نەیتوانی نمایشبکات. من ئەو شەوە ئەو بیرۆکەیەم بۆهات، کە ئەگەر جێگای خان بزانم دەتوانم لەمجۆرە شەوانەدا کە نمایشی نییە و ئەوانی دی هەموو لە شاری یارییەکەدا سەرقاڵی ئیشکردنن، خان ڕزگاربکەم. دوای هەفتەیەک چاوەدێری بەردەوام شوێنەکەیم دۆزییەوە، لەکەرەڤانەیەکدا لە نزیک بنکەی سەرەکی کۆمپانیا تورکییەکەوە دەژیا، شوێنێک هەر دوو سەد مەترێک لە شاری یارییەکەوە دووربوو. کۆمپانیاکە پاسەوانێکی پیری هەبوو، من دەستێک جلی سەربازیم کڕی و شەوێکیان کە هەوا سروەی نەدەهات، ئەوانی دی هەموو سەرقاڵی کاری خۆیان

بوون. من بە جلە سەربازییەکانمەوە چووم بۆ لای پاسەوانەکە و بەدرۆ گووتم کە لە ئاسایشەوە ڕاسپێردراوم بەبێدەنگی چاوەدێری ئەو شەقامەی ئەودیو بکەم، چونکە سوسەی هەندێک شتی ناسروشتی کراوە و دەبێت ئاگاداربین. پاسەوانەکە پیرێکی خۆشباوەڕ بوو، بە شەرمێکەوە دەرگای بۆ کردمەوە و من چوومە ئەو دیو بیناکەو لە پەنجەرەی کەرەڤانەکەوە خانم لە ناو جێگاکەی خۆیدا بینی، وەک منداڵێکی نەخۆش خەوتبوو. بۆئەوەی ڕانەکات لەمدیوەوە دەرگای کەرەڤانەکەیان لە سەر داخستبوو. بەو کەرەستانەی پێمبوو دەرگاکەم شکاند و چوومە ژوورێ. کە چاوی بە من کەوت حەپەسا، وەک جارەکانی تر نەبوو نەمناسێتەوە، یەکسەر گووتی «سالار خان سەیرمکە، برازا ئازیزەکەم ، ژیان چۆن دەمهێنێت و دەمبات... هەر بەڕاستی بووم بە پووشی دەم با ... من مانگێکە بەردەوام خەونت پێوەدەبینم، لێرە ڕزگارمبکە، من بووم بە گاڵتەجاڕ... بووم بە سینەمای مەملەکەت، نە ئابڕوو، نە کەرامەتم نەماوە، هەڵمگرە و بالێرە بڕۆین».

من بە چاوی پڕ فرمێسکەوە هەڵمگرت و بێئەوەی بتوانم هیچ بڵێم، ماچمکرد و هێنامەوە بۆماڵێ.

تا مانگێک جەمشید خان شەو و ڕۆژ تەنیا ئازارەکانی خۆی بۆ باسدەکردم، گووتی هەموو سیاسییەکان وەک سەگ و مەیمون سەیریانکردوە، ژن و منداڵەکانیشیان فێرکردوە هەروا تەماشایبکەن. گووتی تازە ئەو وەک لیبوکێک، وەک مەخلوقێکی گاڵتەجاڕ، وەک مەیمونێک ناسراوە و هەرگیز ناو و کەرامەتی ناچێتەوە جێگای خۆی. گووتی هەموو منداڵانی ئەم وڵاتە منیان لەو قەفەسی سەگەدا بینیوە، کوڕ و کچی هەموو سیاسییەکان کە سبەینێ شوێنی باوکیان دەگرنەوە و ئەم مەملکەتەیان

بەوەرەسە بۆ دەمێنێتەوە، ئەم خانە لاواز و بێجورم و سووکەیان بینیوە، کاتێک دەموچاوی وەک دەموچاوی گاڵتەجارەکان بۆیەکردوە و فڕیوە. گووتی لەو هەشت مانگەدا بەردەوام لە ئاسمان بیری لە یەک شت کردۆتەوە، خۆکوشتن... خۆکوشتن و هیچی تر. گووتی هەموو شتەکان پێیانگووتووم خۆتبکوژە، هەورەکان، باکان، ئەستێرەکان، هەموو شتێک... هەموو شتێک. دڵنیابوو لە هەر جێگایەکی دییەوە دەربکەوێتەوە سیاسییەکان دەیگرنەوە و دەیخەنەوە قەفەزێک و جلی لیبوکی لەبەردەکەن و دەیکڕن و دەیفرۆشن. گووتی من تا ئەوکاتە ئاسوودەبووم کە حوکمرانانی ئێرە منیان نەدەناسی، ئێستا تا پیردەبم وازم لێناهێنن و دەمخەنە قەفەزەوە و وەک مەیمون یاریم پێدەکەن. ڕای وابوو ژیانی هیچ مانایەکی نەماوە و چارەیەکی لەبەردەمدا نییە، ئەوەنەبێت تا مردن لەم ژوورەدا بێت یاخود خۆی بکوژێت. هەموو ڕۆژێک چەند سەعاتێک لە من دەپاڕایەوە بیکوژم، چونکە چیتر بەرگەی ئەم هەموو فڕین و کەوتنەخوارەوەیە ناگرێت، چیتر بەرگەی ئەم هەموو سڕینەوە یەک لە دوای یەکەی یادەوەری ناگرێت. دەیگووت تواناو بوێری ئەوەی نییە دەست بۆ ژیانی خۆی بەرێت، بەڵام من تەنیا بە یەک گوللە لە هەموو ئەم زەلیلییە گەورەیە ئازادیدەکەم. منیش لەگەڵیدا دەگریام و دەمگووت نەدەمەوێت، نەهێزی ئەوەم هەیە کاری وا بکەم. من پێمگووت لەبری خۆکوشتن بڕۆ... بڕۆ بۆ مەملەکەتێکی تر، بەڵکو لەوێ لە ناو میللەتێکی تردا سروشتی ئینسانی خۆت بدۆزیتەوە و ژیانێکی نوێ دەست پێبکەیت لەم ژیانەی ئێرەت کەمێک باشتر بێت. سەرەتا ڕای وابوو کە سوودی نییە، چونکە هەر لە ئاسمان بەربووەوە هەموو یادەوەری دەسڕێتەوە و لەوسەری زەمینیشەوە بێت خۆی لەبیردەکات و جگە لە نیشتیمان هیچی تری لە بیرنامێنێت... من بووم ئەو چارە

سیحراوییەم بۆ دۆزییەوە، من بووم پێمگووت ئەی خانی گەورە، ئەی تەنها قارەمانی پاک و بەدی هەموو ژیانم، لەشی تۆ خۆی لە پارچە کاغەزێکی گەورە دەچێت، من هەموو ژیانی خۆتت لە سەر جەستەت بۆ دەنوسمەوە، بۆئەوەی هەرکات لە ئاسمان کەوتیتە خوارێ و یادەوەریت نەما، نوسینەکانی سەر لەشت بخوێنیتەوە و هەموو شتێکت لەیادبێت، لەیادت بێت تۆ کێیت و لە چی ڕادەکەیت، لەیادت بێت لە کوێوە هاتوویت و بۆ نابێت بگەڕێیتەوە، لە یادت بێت کە دەبێت چیبکەیت و چ ڕێگایەک بگریت، چی هەڵەیەکت کردوە و چی دووبارەنەکەیتەوە. من ڕۆژێک چووم و یەکێکم لەو تاتوکێشانە هێنا بۆ ماڵێ و هەموو چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە، پێکەوە لەسەر لەشی جەمشید خان دانیشتین و وەک ئەوەی ئەو کتێبێک بێت، دێڕ دێڕ کەوتینە کورتکردنەوەی ژیانی و بە وشە کەوتینە کوتانی ئەو لەشە تەنک و لاوازەی. سنگی، پشتی، زگی، قاچەکانی تادەگەنە بنی پێی، دەستەکانی تا دەگەنە نێو لەپی. هەموویمان بۆ ژمارە کرد و من هەرچییەکم دەربارەی ژیانی دەزانی لەسەر لەشی بۆم نوسی. ناو و ناونیشانی خۆشمم بۆخستە سەر پشتی دەستی ڕاستی تا هەمیشە منی لە بیر بێت و لە هەواڵی خۆی ئاگادارمبکاتەوە. ئەوە تاکە چارەبوو جەمشید خان ژیانی خۆی بیرنەچێتەوە و نەگەڕێتەوە بۆ ئەم وڵاتە. خۆی بە بیرۆکەکە سەرسامبوو، ئەوە بەختەوەریدەکرد شتێک هەبێت ژیانی ڕاستەقینەی خۆی بیربخاتەوە... لە ڕابوردوودا چی بووە و چی کردوە. کە دواجار لە بەر ئاوێنەکەدا وەستا و خۆی بینی، پێکەنی و گووتی «ئێستا لە لەوحێکی نوسراوی دێرین دەچم، ئەوەک لە مرۆڤ... لەهەر جێگایەک بمگرن سەرەتا هەوڵدەدەن ئەم نوسراوە دووورودرێژەی سەر لەشم بخوێننەوە، بەڵام خۆشبەختانە ئەم زمانەی ئێمە خۆمان نەبێت هیچ کەسێکی تر لەسەر ئەم

ئەستێرەیە تێیناگات». خان دڵنیابوو بەم لەشە کوتراوەیەوە، تەلیسمی گەورەتر و نهێنی ژیانی بێسنوورتر دەبێت.

ئەو شەوە کە بڕیاریدا بڕوات و نەگەڕێتەوە، بە خۆمان و هەزاران مەتر لە ڕایەڵەوە چووین بۆسەر بەرزترین لوتکەی نزیک شار، لەوێ بەرلەوەی بفڕێت باوەشمان بەیەکدا کرد، جەمشید خان لەو سەر ترۆپکەوە سەیری دونیای کرد و هەناسەیەکی هەڵکێشا، من سەیرمکرد و گووتم «جەمشید خان بزانە، من هەموو ژیانم ئاواتی ئەوەم خواستوە بتوانم یەکجار .. یەکجار وەکو تۆ بفڕم». پێکەنی و گووتی «منیش هەموو ژیانم ئاواتی ئەوەم خواستوە زەوییەک بدۆزمەوە مرۆڤ تێیدا بانەیبات». ماوەیەکی درێژ توند نووساندم بە خۆمەوە، لەدڵەوە دەمویست تا هەتاهەتایە لەلام بێت، تا هەتاهەتایە ڕایەڵگری بم، بەڵام هێدی هێدی هەردووکمان پیردەبووین و ژیان دەیکردین بە ژێرەوە... دڵنیاشبووم ئەم نیشتیمانە جگە لە بەدبەختی هیچی دیکەی بۆ ئەو پێ نییە. نەمدەویست بیگرن و وەک مەیمون بیخەنەوە قەفەز، حەزمدەکرد ئازاد بژی، کەس سووکایەتی پێ نەکات و کەس دەمی نەبەستێت... بە هێمنی لە هەوادا بەرمدا، تۆز تۆز و مەتر مەتر لە زەوی دوورمخستەوە، تا ئەو زیاتر سەردەکەوت من زیاتر تەماشامدەکرد، ئیدی لە جێگایەکدا لە زوڵمەتدا ونبوو، دوا شتی ئەو سڵاوێکی دووربوو کە لە بەرزاییەوە لێیکردم. منیش لەسەر زەوییەوە دەستم بۆ بەرزکردەوە، بەڵام نازانم ئاخۆ دوامالاوایی منی بینی یاخود نا. کە زۆر بەرزبووەوە، کە چیتر پەت نەما بەریدەم، هەستم بە خۆبەردانی کرد لە هەوادا، بێئەوەی بیبینم هەستمکرد با وەک هەیشە دەیبات و بە ئاڕاستەیەک دەیڕفێنێت کە من نازانم چییە و چۆنە و ڕووەو کوێیە.

دوو ساڵ تێپەڕی و من بەردەوام سەیری ئاسمانم دەکرد... هەمیشە ئەو هەستە قووڵە لە دڵمدا بوو کە ڕۆژێک خان وەک چۆن با بردی ئاوەهاش دەیهێنێتەوە. ئەمجارە لە دڵەوە حەزمدەکرد نەگەڕێتەوە، هەردووکمان پیربووین، هەم من و هەم ئەویش، من هێدی هێدی هەستمدەکرد وەک جاران ناتوانم ببمەوە بە ڕایەڵگری ئەو، کەمەکەمە نەخۆشییەکانی تەمەن و پشت ئێشەی بەردەوام و تەنیایی و غەمۆکی بێبڕانەوە لە ناوەوە وێرانیاندەکردم.

دوای دوو ساڵ لە بێدەنگی تەواو، ڕۆژێک یەکێک لە دەرگای دام و کردمەوە، کوڕێکی مێرد منداڵی پازدە ساڵان بوو، زەرفێکی شینی بەدەستەوەبوو، شین وەک ئاسمان. گووتی باوکی ئەم زەرف و نامەیەی بۆ من ناردوە، کە لە جێگایەکی زۆر دوورەوە هێناویێتی. زەرفەکەم کردەوە، نامەیەک و کۆمەڵێک وێنەی جەمشید خانی تێدابوو. بۆ ساتێک موچڕکێکی سارد و قووڵ هەموو گیانی تەزاندم، سەرپەنجەکانم وەها سارد و سڕبوون زەرفەکەم لەدەست کەوتە خوارێ. نامەکە هەواڵی ئەوەم دەداتێ کە دواجار دوای گەشتێکی درێژ بە هەموو ئاسیادا، دوای ئەوەی با لەم شارەوە بۆ ئەو شار و لەم وڵاتی غەمگینەوە بۆ ئەو وڵاتی غەمگین فڕاندویێتی، بەسەر ئەم شەڕ و بەسەر ئەو سنووری ئاسنیندا پەڕاندوێتییەوە، لەم جەنگەڵەوە داوێتییە دەست ئەو جەنگەڵ و لەم ترۆپکی ساردەوە بردوێتی بۆ ئەو ترۆپکی ساردتر، دواجار لە زەوییەکدا گیرساوەتەوە کە سەرزەمینی خۆیەتی و وەک دوا وێستگەی ژیانی تەماشایدەکات. نوسیوێتی لەوێ حەکیمەکان بەسەرییەوەن و هەموو شتێک بەرەو باشی دەڕوات و کێشی وردە وردە زیادیکردوە. دەڵێت ژنانی ئەوێ بە دڵسۆزی خزمەتیدەکەن و خۆشەویستی و میهریان لێدەبارێت.

وەک هەواڵێکی هەرە گرنگی دونیاشم پێبڵێت نوسیویەتی «من چیتر ئەو جەمشید خانە نیم کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبات، ئێستا کێشم وردە وردە پڕ دەبێتەوە و دەبم بە کەسێکی ئاسایی». بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە باسی ئەوەی بۆ نوسیوم کە بەتەنیا دەتوانێت بەزەویدا بڕوات و لە با نەترسێت، دەڵێت چیتر پێویستی بە ڕایەڵ نییە، چیتر هیچ کەسێکیش بە خۆیەوە سەرقاڵ ناکات، سوپاسێکی زۆری من دەکات کە هەموو ژیانم پەتگری ئەو بووم و لە میحنەتی گەورە گەورە ڕزگارمکردوە. من دەیانجار نامەکەم خوێندەوە و دەمزانی خان ئێستا یادەوەرییەکی زیندووی هەیە و شتەکانی لە یادنەچۆتەوە. ئەو لە دوا دێڕی نامەکەیدا پەیمانی ئەوەم پێدەدا گەر هەموو شتێک جێگیربوو، کە تەواو دڵنیابوو جارێکی دیکە با نایبات، بلیتێکی سەفەرم بۆ دەکڕێت و دەینێرێت، تا لەو وڵاتە دوور و لە ناو ئەو نەتەوانەدا کە ڕێزی لێدەگرن ببم بە میوانی ... من دادەنیشم و یەک یەک سەیری وێنەکانی دەکەم، هیچی لە جەمشید خانەکەی جاران ناچێت، بەڵام دڵنیاشم خۆیەتی، پیاوێکی خڕیلانەی مایل بەلای قەڵەویدا، بەتەنیا لە ناو دارستان و باغی پڕ لە گوێزی هیندیدا وێنەی گرتووە، لە سەر دەریای شەپۆلاوی و تورە، لە چێشتخانەی گەورە و لە بازاڕی جەنجاڵدا، لە ناو ڕەشەبای قایمدا کە هەموو شتێکی بردوە ئەو نەبێت. دوا ڕستەی نامەکەی دەڵێت «دەتوانیت بە هەمووان بڵێیت ... بە هەمووان... من چیتر کەسێک نیم با بمبات».

من نامەو وێنەکان هەڵدەگرم و دەڕۆمە دەرێ... بایەکی شێتانە گفەی دێت، خۆڵ وەک بیەوێت زیندەبەچاڵمانبکات بە خەستی دەبارێت، هەستدەکەم تەنیا شتێک منی بەم زەوییەوە دەبەستەوە ئەو ڕایەڵانە بوو کە بۆ جەمشید خانم دەگرت.

دەمەوێت بچمە ناو خۆڵبارین و ڕەشەباکەوە، سەیری ئاسمان دەکەم و هیچ نابینم... بەڵام هەست بە سووکبوونێکی لە ناکاوی خۆم دەکەم، هەست بە لاوازی و کەمجورمی کتوپڕی خۆم دەکەم... ئەو هەستەم لادروستدەبێت کە با دەمبات، توند خۆم بە دەرگاکەوە دەگرم بۆئەوەی نەکەوم... هەستدەکەم ئەمە سەرەتای ترسێکی کتوپڕ و گەورەی منە لە با و ئاسمان... بۆئەوەی با نەمفڕێنێت و چی شتێک لە یادەوەریمدا هەیە نەفەوتێت، بۆ ئەوەی جەمشید خانم لەبیر نەچێتەوە و لەیەکێک لە کەوتنەخوارەوە گەورەکانی ژیاندا ئەو لە خەیاڵمدا ون نەبێت، بەپەلە دەگەڕێمەوە ژوورێ و لەسەر مێزەکەم دادەنیشم و بڕیاردەدەم بنوسم... با لەدەرەوە وەک دڕندەیەکی بریندار دەناڵێنێت، من بێئەوەی گوێ لە هەڕەشەکانی بگرم دەنوسم « لە سەرەتایساڵی 1979 دا کە جەمشید خان بۆ یەکەمجار گیرا تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو...»... ئەوە دەنوسم و دەوەستم ... دوودڵم لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە کە دەزانم ئەوانەی جەمشید خانیان بە ڕاستی نەبینیوە نە هەرگیز باوەڕی پێدەکەن و نە هەرگیز تێیدەگەن.